رۆمان

د. نەوال ئەلسەعداوی

# بیرەوەرییەکانی پزیشکێک

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
جیڤارا کەمال



ڕۆمان

# بیرەوەرییەکانی پزیشکێک

## نەوال سەعداوی        جیڤارا کەمال

نامەی دکتۆرە نەوال سەعداوی بۆ وەرگێڕ لە
2001 / 11 / 9


FROM : (.I.C.C.)  PHONE NO. : 4547846  Jan. 07 2001 02:35AM P1

إلى د. جيفارا كمال عبدالله  فاكس 0044/707647722

تحيات وتقديري وبعد

أشكرك على رسالتك بالفاكس - ويسعدني أن تقوم بترجمة روايتي مذكرات طبيبة إلى اللغة الكردية - وأرجو إرسال نسخة إلي بالبريد من كتابي المترجمة إلى الكردية على عنواني بالقاهرة

مع الشكر والتقدير

د. نوال السعداوي

ملحوظة: أنا أفضل نشر الكتاب (مذكرات طبيبة) مع مقدمة جديدة وشكرا

بە نامەیەک لە ڕێگەی فاکسەوە داوام لە بەڕێز دکتۆرە نەوال کە دوای وەرگێڕانی ڕۆمانی بیرەوەرییەکانی پزیشکێک گەر پێی خۆشبێت پێشەکیەکی نوێی بۆ بنوسێت , لە وەلامدا بە فاکسێک دکترە نەوال ئەم نامەیەی بۆ ناردم :

بەڕێز جیڤارا کەمال

دوای ڕێز و سڵاو

سوپاسی نامەکەت دەکەم لە ڕێگەی فاکسەوە , زۆر خۆشحاڵم کە ڕۆمانی بیرەوەرییەکانی پزیشکێک وەردەگێڕن بۆ زمانی کوردی , هیواخوازم کە هەریەک لەو کتێبانەی وەرگێردڕاونەتە سەر کوردیم بۆ بنێریت بۆ ناونیشانەکەم لە قاهیرە ..

لەگەڵ ڕێز و سوپاسم

د. نەوال سەعداوی

تێبینی / پێمباشە کە بێ پێشەکی نوێ ڕۆمانی ( بیرەوەرییەکانی پزیشکێک بڵاوبکرێتەوە ) سوپاس

ململانێی نێوان خۆم و مێینەییم زۆر زوو دەستی پێکرد .. پێشەوەی مێینەییم پێ بگات و پێشەوەی هیچ شتێک لەبارەی خۆم و ڕەگەزمەوە بزانم .. بەڵکو پێشەوەی بشزانم لەکام دۆخدام پێش هاتنم بۆ ئەم دونیا پان و بەرینە .

ئەوەی کە ئەوسات ئەمزانی ئەوە بوو کە لە دایکمەوە هەمیشە دەمبیست ئەویش ئەوەیە کە من کچم !

وشەی کچیش لەلام خۆی لە تەنها واتایەکدا دەبینێتەوە .. ئەویش ئەوەیە کە کوڕ نیم .. وەك براکەم نیم ..

براکەم قژی کورت ئەکاتەوە و گوێ ناداتە داهێنانی , لەکاتێکدا من قژم درێژ و درێژتر دەبێت و دایکم بۆم شانە دەکات لە ڕۆژیکدا دووجار بە تەوقە و قەیتان و قردێلە بۆم دەبەستێت ..

براکەم بەیانیان کاتێک لەخەو هەڵدەسێت جێگاکەی جێدەهێڵێت و منیش دەبوو جێگاکەی خۆم و ئەوەی ئەویش هەڵبگرم .

براکەم بێ پرسی دایك و باوکم دەچێتە دەرەوە بۆ یاریکردن و چ کاتێک بیەوێت ئەوسا دێتەوە .. منیش چوونە دەرەوەم بێ پرس قەدەغەیە .

براکەم لەکاتی نانخواردندا پارچەیەك گۆشتی لەوەی من گەورەتر دەبات بۆ خۆی و بەخێرایی نان دەخوات و دەنگی ملْچەملْچی خواردنەکەی دێت دایکیشم هیچی پێ ناڵێت .. بەڵام .. من کچم ! پێویستە ئاگاداری هەڵسوکەوتم بم .. پێویستە حەزم بۆ خواردن بشارمەوە و بە هێواشی و لەسەرخۆ نان بخۆم بەبێ دەنگ ..

براکەم یاری دەکات .. باز دەدات .. بزێوی دەکات .. بەڵام من تەنانەت گەر لەکاتی دانیشتنیشمدا تەنها یەك سانتیمەتر کراسەکەم یان تەنورەکەم بەرزبێتەوە و شوێنێکی جەستەم دیاربێت لەلایەن

دایکمەوە بە تیلەی چاوێکی تورەیی و ئاگادار کردنەوە سەرنج دەدرێم و ناچار دەبێت خێرا خۆم داپۆشم ..
خۆم حەشار بدەم و خۆم داپۆشم کە هێشتا منداڵم و تەمەنم نۆ ساڵانە ! بەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە .
دەرگای ژوورەکەم لەسەرخۆم دادەخست و دەستم دەکرد بە گریان ..
یەکەمین فرمێسکم لە ژیانمدا بەهۆی سەرنەکەوتنم لە خوێندندا نەبوو یان لە ئەنجامی ئەوەی شتێکم لە دەست شکابێت .. بەڵکو لە پێناو ئەوەی کە تەنها کچم !
گریام بۆ مێینەییم پێش ئەوەی بیناسم ..
هاتومەتە ژیانەوە لە نێوان من و سروشتمدا دوژنایەتی هەیە . سێ سێ پێ پلیکانی قاڵدرمەکانم دەبڕی و لە یەکەوە تا دەم دەژمارد , براکەم و کوڕان و کچانی گەڕەك و دراوسێ لە چاوەڕوانیمدا بوون تاوەکو یاری دز و پۆلیس بکەین منیش پرسم بە دایکم کردبوو تاکو ڕێگەم بدات یاری بکەم , بازم دەدا دەستو قاچەکانم لە هەوادا یاری پێ دەکردوو بە هەموو توانام ڕامدەکرد .. بۆچی خودا وەك باڵندەیەك منی دروست نەکرد تاکو بە ئاسماندا و لە هەوادا بفڕم وەك کۆتر , منی وەك کچ دروستکرد ؟ وا هات بە خەیاڵمدا کە خودا باڵندەی لە کچان خۆشتر دەوێ , بەڵام براکەم نافڕێت ! ..
بەم دەستەواژەیە کەمێك دڵم هاتەوە جێ .. هەستمکرد کە کوڕ لەگەڵ ئەو هەموو سەربەستە فراوانەی ئەویش وەك من توانای فڕینی نیە .. پاشان واملێهات بە دوای خاڵی لاوازی پیاودا دەگەڕام تاوەکو ئەو لاوازییەی مێینەییم سەپاندوێتی بەسەرمدا لەبیر بکەم .
نەمزانی چی ڕوویدا کاتێک بازم دەدا .. هەستم بە گرژییەکی سەیر کرد لە جەستەمدا و سەرم گێژی خوارد .. دواتر سوراییم بەدیکرد ! ئەمە چیە ؟

دڵم داخورپا و لە یاریەکە کشامەوە و چوومەوە ماڵەوە دەرگای گەرماوەکەم لەسەرخۆم داخست تاوەکو بە دوای نهێنی ئەم ڕووداوەدا بگەڕێم ..
هیچ تێنەگەیشتم .. وای بۆ چووم کە تووشی نەخۆشیەکی کتوپڕ بومەتەوە .. چوومە لای دایکم و بە ترسێکەوە پێموت ..
بینیم دایکم لە خۆشیدا پێدەکەنێت .. سەرم سوڕما چۆن دایکم بەرامبەر ئەم نەخۆشیە ترسناکە پێکەنینی دێت ..
لای خۆیەوە دایکم هەستی بە سەرسوڕمانم کردوو دەستی گرتم و بردمیە ژورەکەی خۆم و دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی ئافرەتە خوێناویەکان .
ماوەی چوار ڕۆژ لە ژورەکەم مامەوە و نەمدەتوانی خۆم نیشانی براکەم یان باوکم و تەنانەت خزمەتکارە بچکۆلەکەی ماڵەوەش بدەم لەوانەیە ئەمان هەموو بەم ڕووداوەیان زانیبێت .. گومانی تێدا نیە دایکم ئەم نهێنیە نوێیەی درکاندووە .. پاشان دەرگای ژورەکەمم داخست و کەتمە بیرکردنەوە لەگەڵ خۆمدا لەبەرامبەر ئەم دیاردە سەیرەدا .. ئایا ڕێگەیەکی تر نەبووە گوزارشت لە پێگەیشتنی کچان بکات جگە لەم ڕێگە قێزەونە ؟ ئایا ئەوە ڕاستە مرۆڤێک بەهۆی کارێکی ماسولکە خۆنەویستەکانیەوە چەند ڕۆژێك بباتە سەر ؟ لەوانەیە خودا زۆر قینی لە کچان بێت بۆیە ئەم حاڵەتەی بەسەردا سەپاندوون .. وا هەستمکرد کە خودا ئاسانکاری لە هەموو شتێکدا بۆ کوڕان کردووە .. پاشان لەسەر جێگەکەم بەم داڵغانەوە هەستام و چوومە بەردەم ئاوێنەکەم .. ئەمە چیە ؟ ئەم دوو گۆیە چیە لەسەر سنگم هاتوو ؟
ئاه .. خۆزگە ئەمردم !
ئەم لەشە سەیرە چیە کە هەر ڕۆژەی عەیبەیەکی نوێم بۆ پەیدا دەکات کە لە لاوازی و ملکەچیم زیاد دەکات ؟!

* * *

قینم لە مێینەییم دەبۆوە ..
وا هەستم دەکرد کۆت و زنجیرە .. کۆت و زنجیرە لە خوێنم و دەمبەستێتەوە بەناو جێگەوە ئیدی چیتر ناتوانم ڕابکەم و باز بدەم ..
کۆت و زنجیرە لە کرۆك و خانەکانی جەستەم .. بە زنجیرەی عەیبە و عار و مێینەیی دیلی کردووم بۆیە بەسەر خۆم و نەهامەتیەکانمدا دەشکامەوە ..
توانای ڕاکردنم نەماوە .. ناتوانم یاری بکەم ..
ئەم دوو گرێیە لەسەر سنگم گەورە دەبن و دەلەرنەوە هەر کە هەنگاو بنێم .. بەپێوە ڕادەوەستم بەو لەشە درێژە بەتاڵەوە و بە قۆڵم سنگم دەشاردەوە و سەرنجی براکەم و هاوڕێکانیم دەدا یارییان دەکرد ..
گەورە بووم .. گەورە بووم لەگەڵ براکەمدا هەرچەند ئەو لە من بەتەمەنترە .. گەورە بووم لەچاو منداڵاندا و خۆم لە نێوانیان کشاندەوە و بەتەنها دادەنیشتم و بیرم دەکردەوە ..
منداڵیم کۆتایی هات .. منداڵییەکی کورت و خێرای بێ واتا .. هێندەم هەست پێ نەکرد تا تێپەڕی و لەو دواییەوە جەستەی ئافرەتێکی پێگەیشتوی بۆ جێهێشتم کە لە ناخیدا منداڵێکی تەمەن دە ساڵانی لەخۆ گرتبوو ..

* * *

چاوەکانی کابرای دەرگاوانم بەدیکرد پرشنگی دەدا لە نێوان دەموچاوێکی ڕەش , ڕەشی خەڵوز .. کاتێک لەسەر کورسیە دوو کەسیە دارینەکەی بەر دەرگا دانیشتبووم و سەرنجی براکەمم و هاوڕێکانیم دەدا سەرقاڵی یارێکردن بوون و ڕایان دەکرد و بازیان دەدا .. کابرای دەرگاوان لێم نزیک بوەوە و هەستمکرد بەشێکی دشداشە بەری زبر بوو بەر قاچم کەوت بەشێوەیەکی قێزەونانە خۆم

لێ دورخستەوە و سەرنجی براکەم و هاوڕێکانیمدا و هیچ گوێم پێ نەدا دواتر هەستمکرد پەنجە زبر و گەورەکانی بەقاچەکانمدا بە هێواشی سەری دەخست بۆ سەرەوە بۆ ژێر کراسەکەم ! .. بە پەشۆکاوی هەستامەوە سەرپێ و لێی دورکەوتمەوە و ڕامکرد .. ئەم پیاوە قێزەونە ڕەشەش بەدوای مێینەییمدا دەگەڕێت ؟! بەردەوام بووم لە ڕاکردن تا خۆم کردەوە بە ماڵەوەدا .. دایکم هۆکاری بێزاریمی لێ پرسیم .. نەمتوانی هیچی پێ بڵێم .. لەوانەیە هەستم بە ترس کردبێت یان عەیبە یان هەردووك پێکەوە .. یان لەوانەیە وام هەست کردبێت کە لێم برەنجێت و چیتر ئەو هاوڕێیەتی و نزیکییەمان بۆ یەکتر نەمێنێت کە وای لێ دەکردم سەرجەم نهێنیەکانمی لا بدرکێنم .

* * *

چیتر نەدەچومە دەرەوە .. هەروەك چیتر لەسەر کورسیە دارینەکە دانەدەنیشتم .. لەدەست ئەو هەموو بونەوەرە سەیرانە ڕامکرد کە سمێڵ درێژ و دەنگ زبر و گڕن و ناویان ( پیاوە ) .. بۆ خۆم خودی خۆم جیهانێکی جوان و ڕازاوەم بنیاتنابوو لە خەیاڵمدا .. تیایدا خۆمم کردبوو بە خوداوەند , پیاوانیشم تیادا کردبووە بونەوەرانێکی گێل و لاواز کە هەمویان لە خزمەتمدا بوون ..
لەو مەملەکەتەی بۆ خۆمم ڕازاندبوەوە لەسەر تەخت دادەنیشتم و بووکە شوشە جوانکیلەکانم دەڕازاندەوە و لەسەر کورسیەکان دامدەنان و بووکە شوشە کوڕەکانیش لەسەر زەویەکە و دەستم دەکرد بە گێڕانەوەی چیرۆك و بەسەرهات..
لەو ژیانە تەنیایەمدا کە لە مەملەکەتەکەم و بووکە شوشەکانم پێکهاتبوو کەس سەرقاڵی نەدەکردم جگە لە دایکم .. بە فرمانە زۆرە بێ کۆتاکانی .. کاری ناوماڵ , چێشت لێنان .. جیهانی دەستنیشانکراوی قێزەونی ئافرەتان کە تەنها بۆن و بەرامەی سیر و

پیازی لێ بەرز دەبێتەوە . من هەرگیز بە ویستی خۆم نەدەچوومە ئەو جیهانە سەیرە بچکۆلانەیە دایکم دەهات و بە زۆر پەلی دەگرتم و بەرەو چێشتخانە ( مەتبەخ ) ڕاپێچی دەکردم و دەیووت : چارەنوست شوکردنە .. شوکردن ! شوکردن ! ئەو وشە قێزەونە کە دایکم ڕۆژانە چەندینجار دوبارەی دەکردەوە تاکو لەبەرچاوم ناشرین بوو .. هەر کە گوێم لەو وشەیە دەبوو یەکڕاست لەپێشچاوم وێنەی پیاوێکی ورگ زل دەهاتە بەردەمم کە لە ناو ورگیدا مێزیکی خواردنی تیادابوو ..

لە خەیاڵمدا بۆن و بەرامەی چێشتخانە بەسترابوەوە بە بۆن و بەرامەی شوکردن و ژیانی هاوسەرگیری ..

هەر بۆیە ناوی مێرد و بۆنی خواردنم لەبەرچاو کەوت .

* * *

نەنکم لە چەنەبازی کەوت و بە هەردوو چاوە لێڵ و تەڵخەکانیەوە هەستم دەکرد سەرنجی ئەو دوو گرێیەی سەر سنگمی دەدا پاشان چرپاندی بەگوێی دایکمدا ..

ئینجا دایکم وتی : ئەو کراسە قاوەییە بپۆشە و بچۆ بەخێرهاتنی ئەو میوانەی باوکت بکە لە هۆڵەکە دانیشتووە ..

بۆنی پێڵاوەکانیم کرد لە کەشوهەوای ناوماڵەکەدا ..

زۆرجار بەخێرهاتنی میوانەکانی باوکمم دەکرد و قاوەم بۆ دەبردن ..

هەندێکجار و ناوە ناوە لای باوکم و میوانەکانی دادەنیشتم کاتێک باوکم باسی سەرکەوتنی منی بۆ دەکردن لەوانەکانم و قوتابخانە , زۆرم پێخۆشبوو , وام هەست دەکرد باسکرنی من لەلایەن باوکمەوە بۆ میوانەکانی دان پێدانانێکی باوکمە بە ژیریمدا و لەدونیای ئافرەتانی تاریك دەرمدێنێت کە بۆنی پیاز و شوکردنی لێدێت ..

بەڵام بۆچی كراسە قاوەیی ڕەنگەكە ؟ ئەو كراسە نوێیەی كە زۆر قینم لێیەتی لە سنگەكەیدا شتێكی ڕەقی تیادایە ڕێك لەسەر مەمكەكانم دەوەستان و هێندەی تر بەرز نیشانی دەدان .. بینیم دایكم سەرنجم دەدات و دەمپشكنێت .. وتی : كوا كراسە قاوەییەكە ؟ بە توڕەییەكەوە وەڵامم دایەوە : لەبەری ناكەم ! .. دیمەنی یاخیبونی لە ڕوخسارمدا بەدیكرد , پاشان بە پەژارەییەكەوە پێی وتم : باشە برۆكانت ڕێك بكەوە .

سەیری دایكم نەكرد .. پێشئەوەی كە دەرگای هۆڵەكەش بكەمەوە تا بچمە ژورەوە بە ئەنقەست هێندەی تر برۆكانم شێواند .. بەخێرهاتنی هاوڕێكەی باوكمم كردوو دانیشتم .. دەموچاوێكی ترسناكم بەدیكرد تێڕوانینێكی وردی هەیە كە لە سەرنجدانەكەی نەنكمی دەكرد ..

باوكم وتی : ئەمساڵ یەكەمی پۆلەكەی بووە لە سەرەتایی ..

هەستمكرد كابرا هیچ بایەخێكی نەدا بەم قسەیە ..

بینیم تێڕوانینە پشكنەرەكانی بەدەوروبەری جەستەمدا دەگێڕێت و دواتر لەسەر سنگم چاوەكانی جێگیر دەكات ترسام و هەستامە سەرپێ و بە پەلە چوومە دەرەوە وەك ئەوەی خێوێك بەدوامەوە بێت ..

دایكم و نەنكمم لەبەردەرگای دەرەوە پێگەیشت و هەردوكیان پێكەوە وتیان : ها .. چیتكرد ؟

یەك قریشكەم كرد بەسەر هەردوكیاندا و ڕامكردە ژورەكەم و دەرگام لەسەرخۆم داخست و چووم بەلای ئاوێنەكەمەوە و سەرنجی سنگی خۆمم دەدا ..

قینم لێیان بوو ! ئەم دوو بەرزییە ! ئەم دوو پارچە گۆشتە كە پاشە ڕۆژم دیاری دەكەن ! حەزم دەكرد هەردوكیان بە چەقۆیەكی تیژ لێ بكەمەوە ! بەڵام نەمدەتوانی .. توانیم تەنیا بیانشارمەوە .. بە

پشتێنێکی توندوو ئەستوور پەستانیان بخەمە سەر و نزمیان بکەمەوە ..

* * *

ئەم قژە درێژە قورسە کە بۆ هەموو جێیەك لەسەر سەرم هەڵمگرتووە .. هەموو بەیانیەك دوام دەخات , لە گەرماو بەهیلاکم دەبات , هاوینان گەردنم داخ دەکات ..
بۆچی نابێت کورت و سەربەست بێت وەك قژی براکەم ! هیچ ئەرك و زەحمەتیکی بۆ دروست ناکات ؟ بەڵام دایکم بووە بە سەرداری ژیانم و پاشەڕۆژم و جەستەم تەنانەت قژیشم .. بۆچی .. ؟
لەبەرئەوەی منی بووە ؟ بەڵام دەبێت گرنگی چی بێت لە بوونی مندا ؟ ئەو وەك هەر ئافرەتێکی تر ژیانی ئاسایی خۆی پیادە کردووە پاشان من هاتووم بەبێ ویستی ئەو لە ساتێکدا لەو ساتانەی خۆشی ئەو بووە .
هاتووم بێئەوەی بمناسێت .. بێئەوەی هەڵمبژێرێت .. بێئەوەی منیش ئەو دەستنیشان بکەم .. من وەك کچێك سەپێنرام بەسەر ئەودا و ئەویش بەسەر مندا وەك دایك .. ئایا دەبێت مرۆڤ بونەوەرێکی خۆشبوێت بەسەریدا سەپێنرابێت ؟ وە گەر دایکم بە ناچاری و بەهۆی غەریزەوە منی خۆشبوێت ئەبێت چ پاداشتێکی لەو خۆشەویستیەدا هەبێت ؟ وە ئایا هیچ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ئەو پشیلەیەی ساتێک بێچوەکانی خۆش دەوێت و ساتێکیتر دەست دەکات بە خواردنیان ؟
ئایا ئەو توندوتیژییەی دایکم پیادەی دەکات لە دژم و زۆر ئازارم دەدات گەر بیخواردمایە باشتر نەدەبوو ؟!

وە گەر دایكم خۆشەویستیەكی ڕاستەقینە منی خۆشدەوێت و خوازیاری خۆشی و شادی منە , نەك خۆی , ئەی بۆچی فرمان و حەزەكانی لە دژی حەز و هیواكانی منە و جیاوازە ؟!
ئایا دەبێت منی خۆشبوێت لەكاتێكدا ڕۆژانە زنجیر لە دەست و قاچ و گەردنم دەكات ؟!

* * *

بۆیەكەمجار لە ژیانمدا لە ماڵەوە چوومە دەرەوە بێئەوەی پرس بە دایكم بكەم .. كاتێک بە شەقامەكاندا دەرۆیشتم لەگەڵ هەر هەنگاوێكمدا بڕوا بەخۆم و جۆرێك لە ململانێم لا دروستبوو بەڵام دڵم لە ترسان لێی دەدا ..
پاشان نوسراوێكم بەدیكرد كە نوسرابوو : ئارایشتگای ئافرەتان ..
بە دوودڵیەكەوە چوومە ژورەوە ..
تاڵە تێك ئاڵاوە قورسەكانی قژمم بینی چۆن لەنێوان دەمی ئەو مقەستە تیژەوە دەپسێن و دەكەونە خوارەوە بۆسەر زەوی ..
ئەمە ئەو تاڵانەن كە دایكم دەڵێت تەخت و تاجی ئافرەتن ! باشە بەوجۆرە و وا خێرا تاجی ئافرەت لە ساتێكی سوربووندا دەكەویتە خوارەوە ؟ هەستم بەبێ بایەخی و لاوازی ئافرەت كرد .. بەچاوی خۆم بینیم كە بڕوایان بە شتێک هەیە هیچ گرنگییەكی نیە و بێ كەڵكە .. هەر ئەو سوكایەتیەی ئافرەت وایلێكردم فێری شتێكی نوێ ببم و بەهێز ببم و بگەڕێمەوە ماڵەوە بەو دوو پێیەم زیاتر جێگیریان بكەم لەسەر زەوی و بێ ترس و بە لەشێكی ڕێك و پڕ لە بڕوابوون بە خود هەنگاو بنێم , پاشان توانیم بە هەمان هێزەوە و بە هەمان سوور بونەوە لەبەردەم دایكم بەو قژەی كورتم كردبوەوە بوەستم ..
دایكم قریشكەیەكی كرد بەسەرمدا و زللەیەك .. دووان .. سیانی لێدام .. منیش لەبەردەمیدا هەر وەستابووم .. وەك ئەوەی بەستبمی

.. وەك ئەوەی سوور بوون و ململانێم کردبمیە هێزێک کە هیچ شتێک کاری تێ نەکات ..
کە دەستی دایکم بەر دەموچاوم دەکەوت وەك ئەوە وابوو بەر بەردێکی گرانیت بکەوێت ..
چۆن نەگریام ؟ من کە کاتێک بوو بە تووڕەبونێك یان زللەیەکی سووك و ئاسایی دەگریام !
بەڵام فرمێسکم نەهاتە خوارەوە .. چاوەکانم کراونەتەوە و سەرنجی چاوەکانی دایکمی دەدا ..
دایکم بەردەوام بوو لە لێدانم .. پاشان بە بێزاری و نیگەرانیەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشت و لەبەرخۆیەوە دەیوت : شێت بووە !
زۆرم بەزەیی پێیدا هاتەوە کە بەو شێوە لاواز و شکست خواردووە بینیم , حەزیکی زۆرم هەبوو کە بە قووڵی باوەشێکی پێدا بکەم و لەنێوان دەستەکانی و سەر سنگی تێر بگریم و ماچی بکەم .. پێی بڵێم : ژیری ئەوە نیە هەمیشە گوێت لێ بگرم ..
بەڵام ئەم حەزەم شاردەوە و نەمهێشت هەست بەوە بکات کە من بەو شێوەیە سەرنجی دەدەم , بەرەو ژورەکەم هەڵاتم .. پاشان سەرنجی ئاوێنەکەمدا زەردەخەنەیەك گرتمی کاتێک کە قژە کورتەکەم بینی لەگەڵ ئەو بریسکەیەی لە سەرکەوتنەوە سەرچاوەی گرتووە و چاوەکانمی پڕ کردووە .. بۆیەکەمجار بوو زانیم سەرکەوتن چۆنە .. ترس تەنها شکست بەرهەمێتی .. سەرکەوتنیش تەنها بە ئازایەتی دێتە بەرهەم .. ئەو ترسەی لەبەرامبەر دایکمدا هەمبوو ڕەویەوە و نەما .. هەستمکرد ئەو تەنها ئافرەتێکی ئاساییە و زللەکانیشی کە لێی قایمتر نیە چیتر سڵم لێی نەدەکردەوە .. لەبەرئەوەی ئازاری نەمابوو ..

*　　*　　*

ماڵەوەم بەرچاو کەوتبوو ژووری کتێبخانەکەمی لێ دەرچێت ..

قوتابخانەشم خۆشدەویست جگە لە وانەی بەڕێوەبردنی ماڵ ..
ڕۆژەکانی هەفتەشم خۆشدەویست جگە لە ڕۆژی هەینی ..
لەسەرجەم چالاکیەکانی قوتابخانەدا بەشداریم دەکرد .. چوومە کۆمەڵەی نواندن و کۆمەڵەی وەرزش و موزیك و وێنە کێشان.. بەوەشەوە نەوەستام هاوڕێکانم کۆکردەوە و گروپیکم دروستکرد و ناوم نا گروپی هاودەمی ! بۆچی وشەی هاودەمیم هەڵبژارد ؟ نازانم .. بەڵام هەستمکرد لە ناخمدا پێویستیەکی زۆرم هەیە بە هاودەمی خەڵکانێکی زۆر سەرقاڵم بکەن و گوێم لێ بگرن و لەگەڵم بەرەو ئاسمان بفڕن ..
واهەستم دەکرد کە هیچ بەرزبونەوەیەك ئەو مەشخەڵەی لە ناخمدا تاوی سەندووە ناکوژێنێتەوە .. بیزاربووم لە وانەی دووبارە و لە یەکچوەکان .. من هەر بابەتێك یەکجار دەمخوێندەوە .. تەنها یەکجار ..
هەستمدەکرد دوبارەبونەوە دەمخنکێنێت .. دەمکوژێت .. من هەمیشە خوازیاری شتی نوێ بووم .. نوێ .. هەمیشە ..

*　　*　　*

هەستم پێ نەکرد کاتێک هاتە ژوورەکەم و لامدا وەستا لەوکاتەی سەرقاڵی خوێندنەوە بووم تا وتی :

- حەز ناکەی کەمێك بحەوێیتەوە ؟

منیش زۆرم خوێندبوەوە و هیلاک ببوم پێکەنیم و وتم:

- حەز ئەکەم لە چۆڵەوانیەکدا پیاسە بکەم .
- پاڵتۆکەتەت لەبەر بکە و بابڕۆین .

خێرا چوومە پاڵتۆکەم و ڕامکرد بۆلای .. خەریکبوو دەست بخەمە دەستی و بەیەکەوە ڕابکەین وەك چۆن کە منداڵ بوین وامان دەکرد , بەڵام کە سەرنجی چاوەکانیمدا ئەو ساڵە دورودرێژانەم بیرهاتەوە کە تێپەڕیکردووە و یاریم تیادا نەکردووە , لەو ماوەیەدا قاچەکانم

ڕاکردنیان بیرچۆتەوە , لەسەر ڕۆیشتنی هێواش و لەسەرخۆ ڕاهاتوون وەك گەورەکان ..
بۆیە دەستمکردە گیرفانی پاڵتۆکەم و شانبەشانی لەسەرخۆ هەنگاوم دەنا ..
گوێم لێبوو وتی :
- گەورە بویت .
- هەروەها تۆش .
ئەو ڕۆژەت بیرماوە بەیەکەوە یاریمان دەکرد ؟
- هەمیشە لە ڕاکردن پێشم دەکەوتیت .
- هەمیشە براوە بوویت .
زۆر پێکەنین .. هەوایەکی زۆر چووە سنگمەوە , هەوایەکی خۆش وایلێکردم هەست بکەم کەمێك منداڵی تێپەڕیوم بگێڕمەوە ..
پاشان وتی : دەمەوی پێشبڕکێت لەگەڵدا بکەم .
بە دڵنیابونێك بەخۆم وتم : لێت دەبەمەوە .
وتی : با ببینین .!
پاشان هێڵێکمان لەسەر زەویەکە کێشا .. بە تەنیشت یەکەوە وەستاین .. هاواریکرد : یەك .. دوو .. سێ .. هەردوکمان بەخێرایی ڕامانکرد ...
خەریکبوو پێش ئەو بگەمە هێڵی کۆتایی بەڵام لەدواوە جلەکانی گرتم , قاچم تێکەڵ بوو ئەویش لە تەنیشتمەوە کەوت .. چاوم کردەوە بینیم سەرنجم دەدات تێڕوانینێکی سەیر لە چاوەکانیدا دیاربوو وایلێکردم چی خوێن لە جەستەمدایە بێتە سەر ڕوخسارم .. بینیم قۆڵی بەرەو ناوقەدم دەهێنێت و بەگوێمدا چرپاندی و وتی : ماچت دەکەم .
شۆڕشێك و ڕابونێك لەناخمدا هەڵگیرسا دواتر وەك هەستێك حەزمکرد دەستی توند بکات و باوەشم پێدا بکات و بمنوسێنێت

بەخۆیەوە .. بەڵام حەزی شاراوەم لەوکاتەی لە ناخمەوە سەرچاوەی گرت گۆڕا بە توڕەیی و بێزارییەکی توند..
توڕە بوونم بووە هۆی زیاتر سوور بوونی ئەو و هێندەیتر دەستی توند کرد . نەمزانی ئەو هێزەم لە کوێوە بۆهات بە هەموو توانام دەستیم فڕێدایەوە و بە دەستەکەی ترم چەند زللەیەکم لێدا ..

* * *

لەسەر جێگەکەم چەندجارێك ئەمدیوئەودیوم کرد داڵغەم لێدەدا..
چەند هەستێکی سەیر جەستەی دادەگرتم .. بەڵام لەنێو هەموو ئەو داڵغانەدا تەنها داڵغەیەك دەهاتە پێشچاوم و جێگیر دەبوو..
کوڕی مامەکەم لەسەر زەویەکە لە تەنیشتمەوە ڕاکشاوە و خەریکە قۆڵەکانی لە قەدمەوە دەئاڵێنێت و تێڕوانینە سەرنج ڕاکێشەکانی چونەتە قوڵایی بیرمەوە ..
چاوەکانم لێکنا تاکو لەگەڵ ئەو داڵغەیەدا بکەومە مەلەکردن کاتێک دەستەکانی درێژ دەکات تاکو بەتەواوی لێم دەئاڵێت و خۆیم لێ توند دەکات .. پاشان لێوەکانی دەهێنێت تا بەر لێوم دەکەوێت و توندی دەکات ..
سەرم خستە ژێر بەتانیەکەوە ..
ئایا دەبێت بڕوا بکەم ؟! ئەم دەستەی کە زللەکەم پێ لێدا هەمان ئەو دەستەیە کە بە داڵغەوە بە لەرزۆکی لەناو دەستیدایە ؟! بەتانیەکەم لەخۆم قایمکرد تا لەنێوان خۆم و ئەو داڵغە سەیرەدا بەربەستێک دروست بکەم کەچی هەر بۆم دەهاتە ژێر بەتانیەکەوە .. ناچار سەرینەکەم خستە سەر سەرم و ڕوخسارم بە هەموو توانام تا ئەو دیوەزمە سەرکێشە بخنکێنم .. بەردەوامم لەپەستان خستنە سەر سەرینەکەم تاکو خەو خنکاندمی ..

* * *

بەیانی چاوەکانم کردەوە خۆر هەڵهاتبوو بە تیشکەکانی سەرجەم داڵغە و دێوەزمەکانی ناو تاریکی شەوی لابردبوو ..
پەنجەرەکەم کردەوە هەوایەکی خاوێن چووە سنگمەوە و هەموو شوێنەوارە جێماوەکانی داڵغەی شەوی ڕابردوومی لەناو برد ..
زەردەخەنەیەك گرتمی بۆ حاڵی خۆم , ئەم خودەی من کە چەند لاواز و ترسنۆکە کاتێک بەئاگاو بەخەبەرم , بەڵام لە تاریکیدا دزە دەکاتە ناو جێگەکەم و دەورووبەرم پڕ دەکات لە داڵغە و تارمایی !

* * *

قۆناغی ئامادەییم بە یەکەمی پۆلەکەم تەواوکرد .. ئەنجا دانیشتم کەوتمە بیرکردنەوە چی بکەم ؟
دەتوانم چی بکەم منێك قینم لە مێینەییمە نیگەرانم لە سروشتم و خۆمم بێبەری کردووە لە جەستەم ؟!
هیچ نیە جگە لە ئینکاری .. بەگژداچوونەوە .. بەرهەڵستی !
ئینکاری لە مێینەییم دەکەم .. بەگژ سروشتمدا دەچومەوە .. بەرهەڵستی لە هەموو حەزەکانی جەستەم دەکەم ..
بۆ دایکم و نەنکمی دەسەلمێنم کە من وەك ئەوان ئافرەت نیم.. من لە چێشتخانە ( مەتبەخ ) ژیانم لە جنینی پیاز و لە ڕنەدانی سیردا بەسەر نابەم .. تەمەنم لەپێناو مێرددا بەسەر نابەم بخوات و بخوات .. بۆ دایکمی ئەسەلمێنم کە من لە براکەم و لە پیاو .. هەموو پیاوان ژیرترم .. لە توانامدا هەیە هەموو ئەو شتانەی باوکم دەیکات منیش ئەنجامیان بدەم ..
کۆلیجی پزیشکی ؟! بەڵێ پزیشکی ..
ئەم وشەیەم زۆر لا قورس بوو .. چاویلکەیەکی بریقەداری سپی بەبیرمدا دەهێنا کە لە ژێرەوەیان دوو چاوی زیتەڵە هەبن بەخێرایی بجوڵێن و بێن و بچن .. پەنجەی پتەو و گرنجگرنج سرنج و دەرزیەکی درێژی تیژی پێیە ..
یەکەمین پزیشك کە لە ژیانمدا بینیم ..

دایكم بە ترسێكەوە لێی دەڕوانی و بە نەوازش و ڕێزەوە سەرنجی دەدا ..
براكەم لە ترسان هەڵدەهات .. باوكیشم لەناو جێگەكەیدا بە چاوێكی كزی وەك ئەوەی داوای ڕەحمەت و بەزەیی لێ بكات لێی دەڕوانی ..
بۆ سروشتی دەسەلمێنم كە ویڕای ئەوەی ئەو جەستە لاوازەی بەبەردا كردووم بە هەموو ئەو عەیب و نەشازیانەی لە دەرەوە و ناوەوە پێوەیەتی بەسەریدا سەربكەوم .. دەیخەمە بەندیخانەی ئاسنینی بیر و ژیریم .. هیچ بوارێكی ئەوەی نادەم ڕاپێچم بكات بۆ ڕیزی ئافرەتانی بێ بایەخ و بێ كەڵك.

* * *

لە تارمەی كۆلیجی پزیشكی وەستابووم بەملاولامدا دەمڕوانی.. بەسەدان لە چاوان سەرنجم دەدەن سەرنجی پشكنین و هەڵسەنگاندن .. سەرم هەڵبڕی و بە هەمان شێوە تێڕوانینم بۆ دەگۆڕینەوە .. بۆچی ئەوان سەیرم بكەن و من نا؟ بۆ ئەوان سەر بەرز بكەنەوە و من سەرداخەم ؟ بۆ ئەوان بێ ترس و بە لەخۆ بوردوییەوە پێ لە زەوی گیر دەكەن و منیش لە هەنگاوەكانمدا قاچەكانم تێكەڵ دەبن !
من وەك ئەوانم .. وەكو ئەوان دەبم بەڵكو بەسەریاندا سەردەكەوم .. پاشان بەخۆمدا چومەوە و خۆم ڕێك كردەوە .. مەمكەكانم بیرچوەوە قورساییان نەماو لەسەر سنگم هەستم پێ نەدەكردن .. هەستمكرد جەستەم زۆر سووك بووە و دەتوانم بە ئاسانی بجوڵێم .. ڕێگەی ژیانم بۆخۆم دیاریكرد .. ڕێگەی بیر .. بریاری سێدارەشم بەسەر جەستەمدا سەپاندوو جێبەجێشم كردوو چیتر هەستم بەبوونی نەكرد ..

* * *

لەبەردەرگای هۆڵی توێکاریدا ( مشرحه ) وەستام بۆنێکی سەیر و بڵاو .. لاشەی مرۆڤ بە ڕووتی .. لەسەر مێزی سپی.. قاچەکانم بەرەو ژورەوە هەڵیانگرتم .. لاشەی پیاوێک بە ڕووتی .. قوتابیەکان لەملاولاوە سەرنجم دەدەن و زەردەخەنە دەیانگرێت تا بزانن چی دەکەم ..
خەریکبوو ڕووم وەرگێڕم و بەرە و دەرەوە هەڵبێم .. بەڵام نا .. واناکەم .. سەرنجی دەوروبەری خۆممدا بینیم قوتابیەکان لە دەوری لاشەی ئافرەتێک کۆبونەتەوە و بێ ترس و سڵەمینەوە لێی ورد دەبونەوە ..
تەواو لە لاشەی ئەو پیاوەی لەبەردەممدا بوو ورد بوومەوە .. نەشتەرەکەشم بە دەستمەوە گرتبوو ..

*    *    *

ئەمە یەکەمین گەشتم بوو بۆلای پیاو و پیاوێتی .. تیایدا پیاو هەیبەت و توانا و گەورەیی بۆ دروستکراوی لەدەستداوە .. پیاو لەسەر تەختەکەی هاتۆتە خوارەوە و لەسەر مێزێك لە نزیك ئافرەتێکدا فڕێدراوە .. بۆچی دایکم هەموو ئەو جیاوازیانەی لە نێوان من و براکەمدا دادەنا و پیاوی لەمن کردبووە خوداوەندێك کە هەموو تەمەنم تەرخان بکەم لە خواردن دروستکردندا بۆی ؟
بۆچی کۆمەڵگە هەوڵدەدات قایلم بکات بەوەی کە پیاویتی پلەی شەرەفی پێدراوە و مێینەییش سوکایەتی و لاوازییە ؟
دەبێت دایکم بڕوا بکات کە من لەبەردەم پیاوێکی ڕووتدا وەستاوم و نەشتەرێکم بەدەستەوەیە و ورگی و سەری پێ هەڵدەدڕم !
دەبێت کۆمەڵگە بڕوا بکات کە من لاشەی پیاوێکم لەبەردەستدایە هەڵیدەدڕم و پارچە پارچەی دەکەم بێئەوەی هەست بکەم کە ئەوە پیاوە !

ئایا دەبێت کۆمەڵگە کێ بێت ؟ ئایا بریتی نین لە پیاوانی وەك براکەم کە دایکم هەر لە منداڵیەوە وای پەروەردە کردووە کە خۆی بە خوداوەند بزانێت ؟ ئایا بریتی نین لە ئافرەتانی وەك دایکم سست و لاواز و بێکار و بەتاڵە ؟ ئەو خەڵکە چۆن دەبێت بەو شێوەیە بیربکەنەوە کە ئافرەتێک نەبێت پیاو نەناسێت جگە لەوەی کە تەنها بریتی بێت لە ماسولکە و شاخوێنبەرەکان و مێشک و ئێسک ؟

جەستەی پیاو ! ئەو شتە ترسناکەی دایکان کچانی بچکۆلەی خۆیانی پێ دەترسینن و دواجار بە گڕی چێشتخانە دەسوتێن لەپێناو تێرکردنی و شەو و ڕۆژ وێنەکەیی و سێبەرەکەی هەڵدەگرن !

ئەوەتا ئەوە پیاوە لەبەردەممدا ڕاکشاوە ڕووت ناشرین پارچە پارچە ..

نەمزانی کە ژیان و ڕۆژگار وا بەخێرایی دایکم بە درۆ دەخاتەوە لام .. یاخود بەوجۆرە تۆڵەم لەپیاو بۆ ئەستێنێت .. ئەو پیاوە بێکەڵکەی ڕۆژگارێك سەرنجی مەمکەکانی دەدام و جگە لەوان هیچی تری تیا بەدی نەدەکردم ..

ئەوەتا من تیر و تێڕوانینەکانی بۆسەر سنگی دەگێڕمەوە ..

ئەوەتا من سەرجی جەستەی دەدەم کاتێک ڕووتە و هەست بە دڵ تێکهەڵهاتن دەکەم ..

ئەوەتا من بە نەشتەرەکەم پارچە پارچەی دەکەم .. ئا ئەمەیە جەستەی پیاو ؟!

لەدەرەوە موو داپۆشێوە و لە ناویشەوە پڕێتی لە بۆگەنی ! مۆخی لە شلەیەکی لینجی سپیدا مەلە دەکات دڵیشی نوقمی خوێنێکی تەڵخە !

چەند قێزەونە پیاو لە ناوەوە و لە دەریشەوە !

*　　　*　　　*

سەرنجی ئەو ئافرەتە لاوەی ژێر نەشتەرەکەمم دەدا .. قژی درێژ و نەرم و ڕەنگکراو بە ڕەنگی سوور بەڵام بە فۆرمالین شۆردرابوو

.. ددانەکانی سپی و بریسکەدار لەنێویاندا ددانێکی زێڕ دیارە .. نینۆکەکانی درێژ و بە ڕەنگێکی سوور ڕەنگ کرابوون .. مەمکەکانی سەر سنگی پوکاوە و شۆڕ .. ئەو دوو پارچە گۆشتەی لە منداڵیمدا ئازارێکی زۆریاندام .. ئەو دوو پارچەیەی پاشەڕۆژی کچان دیاری دەکەن و چاو و مێشکی پیاوانی سەرقاڵکردووە ..
ئەوەتان ئەو دووانە لەژێر نەشتەرەکەمدا پوکاوە و شۆڕ لە شێوەی پێستی پێڵاودان !..
چەندە ناشرینە پاشە ڕۆژی کچان و چەندە قێزەونە ئەوەی چاو و مێشکی پیاوانی پڕ کردووە !
ئەو قژەش کە لە منداڵیمدا ئازارێکی زۆری دەدام درێژ و نەرم ساڵانی منداڵیم دایکم بۆی شانە دەکردم .. تاجی ئافرەت و تەختی جوانی کە بەردەوام لەسەر سەری هەڵیگرتووە و نیوەی تەمەنی لە داهێنان و ڕێکخستن و ڕەنگ کردنیدا بەسەر دەبات .. ئەوەتا لەبەردەممدا و لە تەشتێکی پیسدا دانراوە و لەگەڵ چەند پارچە گۆشتێک و بۆگەنی بێ نرخ و گرنگی فرێدراوە !
هەستم بە دڵ تێکهەڵاتن دەکرد , پارچە گۆشتەکەی ناو دەمم فڕێدا و پارچە نانێکم کردە ناو دەمم .. پارچە نانەکەم خستە ژێر ددانەکانم .. هەوڵمدا بیجووم .. بەڵام ددانەکانم زۆر بە زەحمەت دەجووڵا .. هەوڵمدا قوتی بدەم .. هەستم بە پارچە نانەکە کرد بە دیوارەکانی قوڕگمدا بە زبری بەرەو گەدەم دەڕۆیشت .. هەستمکرد گەدەم ترشەڵۆکەکان لەناوەوە بە مەبەستی هەرسکردنی نانەکە دەڕێژێت .. هەستمکرد بە ریخۆڵەکانم لەگەڵ خانەکانی جەستەم لە ئامادەیی و پێشوازی خواردنەکەدان .. هەستم بە شتێک کرد لەسەر سنگم قورس دەبێت .. دواتر زانیم کە دڵمە گرژ دەبێت و خاو دەبێتەوە و سەرقاڵی ناردنی خوێنە بە خوێنبەرەکاندا .. هەستم بە خوێنکرد بە دەمارەکانمدا ڕێچکە دەگرێت .. هەستم بە هەوا کرد دەچێتە لوتمەوە و بە قوڕگمدا سیەکانم پڕ دەکات .. وەك مێزڵدان فویان تێدەکات ..

تا هەوای ناو سنگم وەستا .. هەستمکرد دەخنکێم .. لێوەکانم ناجوڵێن و قۆڵەکانم جوڵەیان نەماو و دڵم خاو بوەوە .. ئاه .. وا مردم !
بە پەشۆکاوی بازێکمدا ..
نەخێر ! نامرم و وەك ئەو لاشە درێژبوانەم لێبێت لەسەر ئەو مێزانەی بەردەمم !
نەشتەرەکەم فڕێدا و بە ڕاکردن لە هۆڵی توێکاری ( مشرحە ) چوومە دەرەوە .. سەیری خەڵکیم دەکرد لە شەقامەکاندا دەجوڵێن و دەستوقاچەکانیان دەجوڵێنن و بیر ناکەنەوە .. بە ئاسانی بەدوای پاسدا ڕادەکەن .. بە ئاسانی دەمیان دەکەنەوە و لێوەکانیان دەجوڵێنن و هەناسە دەدەن و هەموو شتێک ئەنجام دەدەن و وتوێژ دەکەن .
ئارامییەك هاتەوە بە دڵمدا ..
هێشتا ژیان بەردەوامە .. هێشتا منیش لە ژیاندام .. تەواو دەمم کردەوە و بە هەموو توانام سیەکانم پڕ کرد لە هەوای شەقامەکە .. دەستمکرد بە جوڵاندنی دەستوقاچەکانم لەنێوان هوروژمی خەڵکیدا و ڕۆیشتم .
ئاه .. ژیان چەند ئاسانە کاتێک مرۆڤ بێ گوێ پێدان پیادەی دەکات .

*　　*　　*

شتێکی بازنەیی بچووك , پارچەیەك گۆشتی سپی لەژێر نەشتەرەکەمدا دەخزێت .. بە دەست گرتم و خستمە تای تەرازویەك .. بە پەنجەم دەستم لە سەر ڕوکارەکەیدا .. ڕویەکی لووس و گرنجگرنج .. وەك لووسی مێشک و مۆخی کەروێشك کە لەسەر مێزی نانخواردن بەردەوام مۆخەکەیم لە کەڵەسەرە بچوکەکەی دەردەهێنا .. ئایا ڕێی تێدەچێت ئەمە مێشک و مۆخی مرۆڤ بێت ؟ ئەبێت ئەم پارچە گۆشتە تەڕە مێشکی مرۆڤ و بیری بێت ؟

مێشکی ئەو مرۆڤە زەبەلاحەی سروشتی هەراسان کردووە و چۆتە ناخی زەویەوە و سەرکەوتووە بۆ خولگەکانی ڕۆژ و مانگ ..
مێشکی مرۆڤ کە توانی بەرد پارچە پارچە بکات و شاخەکان بگوازێتەوە و لە گەردی هەوادا ئاگرێك بدۆزیتەوە کە بەشی وێرانکردنی زەوی بکات ؟!
بە نەشتەرەکەم مۆخەکەم کرد بە چەند پارچەیەکەوە .. پارچەکانیش بۆ پارچەی تر .. وورد بومەوە و هەستمگرت و گەڕام هیچم بەرچاو نەکەوت .. تەنها پارچەیەك گۆشتی نەرمە لەژێر پەنجەکانم دەتوێتەوە .. پارچەیەکم لێ خستە ژێر میکرۆسکۆبەوە .. هیچم بەدی نەکرد جگە لە خانەی بازنەیی لە ناویدا ناوکی بازنەیی هەیە لە شێوەی دەنکی ترێدا .. ئەم خانانە چۆن کار دەکەن و وا دەکەن مرۆڤ تێ بگات و هەست بکات ؟ کتێبەکەم کردەوە و سەرنجی وێنەکان و هێڵکارییەکانمدا کە شێوەی کارکردنی مێشکی ڕوون دەکردەوە..
ئەمە چیە ؟ ئەم وێنانە وەك وێنەی ئامێرێکی ئاڵۆز وایە لە شێوەی تەلەفزیۆن یاخود فڕۆکە یا ژێر ئاوگەڕ یان لە شێوەی نەخشەی جیهاندایە .. بە سەدان لە نێوەندی سەرەکی و لق .. سەدان وێستگە .. ملیۆنان هێڵ و خانەی هەستەوەر .. دواتر زانیم کە ئەم پارچە گۆشتەی لەبەر دەستمدایە هەموو ئەمانە بەڕێوە دەبات .. مەسج و داواکاری لەسەرجەم ئەندامەکانی جەستەوە بۆ دێت و دواتر فرمانەکانیان بۆ ڕەوانە دەکات و لە ڕێگەی مولولەکانی خانە گەیەنەر و هەستەوەرەکانەوە دەگوازرێتەوە .. ئەمە چۆن ؟ ئەم پارچە گۆشتە فرمان دەدات بە دڵ و قۆڵ و قاچەکان ؟
بە دڵ دەڵێت بجولێ و بە قۆڵەکان دەڵێت بەرز بەرەوە یان نزم , بە قاچ دەڵێت بڕۆ یا بوەستە ؟ چۆن ئەم تۆڕە تێکەڵە بەڕێوە دەچێت ؟ بێئەوەی یەکێک بەر ئەویتر بکەوێت ؟

چی وای لێدەکات لە نهێنی ئەو نامەیە بگات کە چاو یان لووت یا گوێ , زمان و پەنجەکان دەینێرن بێئەوەی مەسجی هیچ کامێکیانی لێ تێك بچێت ؟
لە ڕێگەی چاوی میکرۆسکۆبەکەوە ڕوانیمە خانە بچکۆلە بازنەییەکان .. هیچی تیادا بەدی ناکەم جگە لە ڕێژەیەکی کەم نەبێت لە پرۆتۆپلازم ..
چۆن ژیان دەچێتە ناو ئەم ڕێژە مردووە لە پرۆتۆپلازم و وای لێدەکات بجولێت و هەست بکات و تێش بگات ؟
پاشان کتێبەکانی کیمیا و سروشت و فیزیۆلۆجیام کردەوە تا بەدوای ئەو نهێنیەدا بگەڕێم ..
کیمیا دەڵێت : لەوانەیە بریتی بێت لە هەندێک کارلێکی کیمیایی کە گەردیلەکانی ماددە دەگۆڕێت و دواتر چالاک دەبێت و دەجولێت ..
سروشت دەڵێت : لەوانەیە جۆرێك بێت لە کارەبا کە پێدەچێت گەردیلەکانی ماددە بگۆڕێت و ژیانی لێ دروست بێت ..
فیزیۆلۆجیاش دەڵێت : بریتیە لەکاردانەوە و دەردان . دەستمدایە خوێندنەوە و گەڕان و لێکۆڵینەوە تا واملێهات شێوەی دروستبوونی ئەو ئامێرەم دەرخ کرد کە پێی دەوترێت مرۆڤ .. سەرجەم ناوەکانی ئەعسابم لەبەر کرد بە ڕێگەکانیانەوە واتە لە سەرەتای وەرگرتنی فرمان لە مێشکەوە وەك ناوەندێك تاکو گەیشتنی بۆ وێستگەی داواکراو و بە پێچەوانەشەوە .. ناوی خوێنبەر و دەمار و مولولەکانم سەرتاپا لەبەرکرد هەر لە درێژی و پانی و لووسی دیوارەکانی ناوەوە تا کۆتایی .. شێوازی پێکهاتنی ئێسک و دڕکە پەتك و خوێن فێربووم .. زانیم چۆن بخۆم و ببینم و گوێ بگرم و بنووم و خەون ببینم .. توانیم بزانم چۆن دڵ لێدەدات و چۆن ڕومەتەکان سوور دەبنەوە .. زانیم چۆن هەست بە پێوەدانی ئاگر بکەم و خۆمی لێ بەدوور بگرم ..

زانیم بۆچی لەشەرمان عەرەق دەکەمەوە و سەرمام دەبێت و لەرز دەگرم کاتێک هەست بە ترس دەکەم .
دڵ وەك ماڵ وایە .. ژووری تێدایە .. ئەو ژورانە دیواریان هەیە پێی دەوترێت ماسولکە .. دەرگایان هەیە بە زمانە ناو دەبرێن .. دیوارەکانی ئەو ژوورانە دێنەوە یەك و دەرگاکان دەکرێنەوە و پاڵ بە خوێنەوە دەنرێت بۆ دەرەوە کاتێکیش خاو دەبنەوە خوێن دێتە ژورەوە و زمانەکان دادەخرێن .. لێدانەکانی دڵ بریتیە لەو هاتن و چونەی خوێن بۆ ناو ژوورەکان .. ئەو دەنگەیە کە لە ئەنجامی کردنەوە و داخستنی دەرگاکان پەیدا دەبێت ..
بەڵام چی وادەکات ماسولکەکانی دڵ لەوە تێبگات چ کاتێک بینەوە یەك و چ کاتێک بە ناوەندێکدا لە سنگدا و لەوێوە بۆ مێشک .. چۆن خوێن لە سیەکانەوە دەگاتە دڵ و چۆن جارێکیتر لە دڵەوە بۆ سیەکان دەگەڕێتەوە تا بپاڵێورێت و پاك بکرێتەوە لە هەرچی ئەو گازە پیسانەی لە مرۆڤدایە ؟
سەرجەم ئەمانە یاسایەکی داڕێژراوی تایبەتی هەیە .. هەموو بەشێکی جەستە بەرگێك و پەستانێکی جێگیر و دیاریکراوی هەیە تاکو خوێن لە جێگەیەکەوە بگوازێتەوە جێگەیەکی تر بێئەوەی تەنها چرکەیەك بوەستێت..
بۆچی هەست بە سوتانی پەنجەم دەکەم بە بەرکەوتنی ئاگر ؟ لەبەرئەوەی دەمارە هەستەوەرەکانی کە پەنجەی داپۆشیوم بروسکەیەکی ناردووە و لە ڕێگەی یەکێک لەو هەستە خانانەوە گەیەنراوەتە مێشک پاشان لەوێ وەرگیراوە کە ئەوە بریتیە لە ئازاری سوتان هەر بۆیە بروسکەیەکی خێرای ناردووە بۆ ماسولکەکانی قۆڵم فرمانی دەداتێ گرژ بێتەوە و پەنجەم دوور بکەوێتەوە لە ئاگرەکە ..
کێ لە ئێمە لەو باوەڕەدا بوو کە نامە و بروسکەکان بێن وبچن لە نێوانی سەری پەنجەکان لە قۆڵەکان و قاچەکاندا مێشکی سەر لەو

بەرزاییەدا لەوکاتەی نازانین چی بکەین لەبەرامبەر ئەو سوتانی ئاگرەدا !
من عەرەق ناکەمەوە تا ئەو کاتەی وتوویژ لە نێوان ناوەندی مێشک و پەریزادەی عەرەق ڕێژدا ڕوو نەدات و لە کۆتاییدا مێشک فرمان بە ڕشتنی فرمێسك و عەرەق دەدات .
کۆئەندامەکانی جەستەم سارد نابێت تا ئەو ساتەی بروسکەی ترس نەگاتە مێشک و دواتر فرمان دەدات بە مولولەکانی  پێست تا گرژ ببن تاکو چی خوێنی تێدایە ئەو ناوچەیە جێبهێڵێت وەك ئامادە باشییەك لە ئەگەری توشبوونی ئازار یان بریندار بوون .. زانیم چۆن وێنەکان لە چاوەوە دەگوازرێتەوە بۆ مێشک تا ببینێت و تێی بگات پاشان بەچاو فرمان دەدات بریسکە بدات و ببینێت .. زانیم چۆن دەنگ لە گوێچکەوە دەگاتە مێشک  تا شی بکاتەوە و تێی بگات پاشان فرمان بە گوێچکە دەدات بکرێتەوە و ببیستێت .. زانیم کە دانەوێڵەی زیندوو لەناو کوورەدا دەبێتە نانێکی مردوو پاشان ئەو نانە مردووە لە ناخی مرۆڤدا بەهۆی گەرمیەوە دەبێتە شیتاڵێکی زیندوو ..
زانیم کاتێک من دەنووم بەشێک لە مێشکمدا ئێشك دەگرێت تاکو وریام بێت .. وریای لێدانەکانی دڵم بێت .. سەرپەرشتی بێدەنگی هەناسەکانم دەکات .. تابلۆکانی خەونەکانم بۆ ڕێکدەخات .. وریاییم دەکات تا لەسەر جێگەی نوستنەکەم نەکەومە خوارەوە لەو ساتانەی کە لە خەونمدا سواری پشتی ئەسپەشێیەك بووم و بەرە و ئاسمان بەڕێ کەوتووم .. یان لەو کاتانەی لە چینەکانی ئاسمانەوە دەکەومە خوارەوە و لەنێو تاڤگە و ئۆقیانوسەکاندا نوقم دەبم .. بە خەبەر و ئاگام دێنێ پێشەوەی ناو جێگەکەم تەڕ بکەم لە ترسی ئەو دڕندەیەی کە لەنێو دارستانەکاندا خەریکە ددانەکانی لە جەستەم گیر دەکات..
لەبەرچاوماندا جیهانێکی بەرینی نوێ کرایەوە .. سەرەتا هەستم بە نامۆیی و ترس کرد بەڵام بەخێرایی لەگەڵ شتەکان ئاوێتە بووم و

شێتی زانین و فێربوون زاڵ بوون بەسەرمدا .. زانست نهێنی مرۆڤی بۆ ئاشکرا کردم و سەرجەم ئەو جیاوازیانەی بە هەڵم کرد کە بەردەوام دایکم دەیویست لە نێوانی من و براکەمدا جێگیری بکات .

زانست بۆی ئاشکرا کردم کە ئافرەت وەك پیاوە پیاویش وەك ئاژەڵە ..

ئافرەت مێشک و دڵ و هەستی هەیە تەواو وەك پیاو .. ئاژەڵیش دڵ و مێشک و هەستی هەیە وەك مرۆڤ .. جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە .. جگە لە چەند جیاوازییەکی ڕووکەش کە سەرجەم کۆکن لەسەر ناخ و ڕەسەنایەتی .

ئافرەت لە ناخیدا بریتیە لە پیاو پیاویش لە قوڵاییدا ئافرەتێکی حەشارداوە .. ئافرەت کۆئەندامەکانی پیاوی تێدایە کە هەندێکیان دیارن و هەندێکیان وون یان شاراوە پیاویش لە خوێندا هۆرمۆناتی مێینەیی هەیە ..

مرۆڤ قەفەزی سنگی لەسەر دڕندەیەکی دارستان دادەخات و ئاژەڵیش لە ناخیدا مرۆڤێک هەیە ..

مرۆڤ کلکی هەیە .. کلکێکی بچووك کورتکراوە لە بڕبڕەیەکی کۆتایی بڕبڕەی پشت , ئاژەڵیش دڵی هەیە لێدەدات و فرمێسکی هەیە ڕێچکە دەکات .. دڵشاد بووم بەم جیهانە نوێیەی کە ئافرەت لەپاڵ پیاودا دادەنێت و پیاویش لەپاڵ ئاژەڵدا .

دڵشاد بووم بە زانست و هەستمکرد کە بریتیە لە خوداوەندێکی بەهێز و گەورە و یەکسانخواز نهێنی هەموو شتێک دەزانێت بۆیە بڕوام پێ هێنا و دانم پیادانا ..

*　　　*　　　*

من تەنها ڕوخسارە بچکۆلانەکەیم دەبینی .. لەگەڵ هەردوو چاوە کز و لاوازەکانی کە لە بێزاریدا بەشوێن سیمایەکی بەخشندە ئامێزدا

دەگەڕا .. هەردوو قۆڵە ڕووتە بەرزکراوەکانی لەسەرمادا دەلەرزی لەکاتێکدا جەستە بچکۆلانەکەی لەژێر چەند پارچەیەکی کانزایی ڕەقدا حەشار درابوو کە لێیەوە چەند سۆندەیەکی مەتاتی هاتبوو بەرەو گوێچکەی ئادەمی کە لە گوێچکەی کەروێشکی دەکرد ناوە ناوەش گوێ لە دەنگی ناو سنگی ڕووتی ناسکی منداڵەکە دەگیرا و خێرا خێرا ئەو پارچە کانزا ستیلەی لەسەر سنگی لادەداو دووبارە بە پەستان دەهاویشتەوە سەری لەگەڵ هەستکردن بە چەند جۆرە پەنجەیەك لەوانە زبر و قورس , هەندێکیتر ناسك و نەرم و بۆیە کراو بە ڕەنگی سوور ..

دواتر گوێبیستی دەنگی مامۆستای پزیشك بووم کە وتی :

- وەرە پێشەوە گوێبیستی ئەم ترپەی دڵە بە .

لە چەند لایەکەوە جێگەم بۆ چۆڵکراو دەستەکانی سەر سنگی منداڵەکە جێگەیان بۆ کردمەوە .. پاشان کەمێك ڕاوەستام و ئامێری بیستنیش لە گوێمدایە چاوەڕوانم تا یەکێک لەو چەند ئامێرەی لەسەر سنگی ئەو منداڵە نەخۆشەیە هەڵگیرێت و منیش ئەوەی خۆم دابنیم , پاشان ئامێرێك بەرزکرایەوە بینیم بازنەیەکی سوور لە جێگەکەی لەسەر پێستە هەڵئاوساوەکە نەخشاوە .. ئامێرەکەم لەدەست کەوتە خوارەوە ناتوانم بیخەمە سەر جەستەی شەکەتی ئەو منداڵە هەستمکرد بێ ئاگایانە دەستم دەلەرزی .. لەو ساتەدا دەستێکی پتەو لەنێو قەرەباڵخی تەندراوی منداڵەکە پاڵی پێوەنام و دووری خستمەوە و قوتابیەکی دیکە هاتە جێگەکەم چاویلکەیەکی ئەستوری لەچاودا بوو بەخێرای ئامێرەکەی چەقاندە سنگی وەك ئەوەی ئەو بازنە هەڵکەندراوە بەدی نەکات لەسەر سنگی منداڵەکە ..

ئاه ..

هاوارێکی لاواز و سست لە نێوانی هەردوو لێوی وشك هەڵاتووی منداڵەکەوە بەرز بوەوە بەڵام لەپانتایی ئەو قەرەباڵخیەدا وون بوو و کەس گوێی لێی نەبوو .. هەستمکرد حەز دەکەم بە هەموو توانام

هاوار بکەم .. هەستمکرد دەستەکانم بەگژ مێشکمدا دەچنەوە و ئارەزووی ئەوە دەکەن لە بێدەنگی یاخی ببن و بەلێدان و وەشاندن بکەونە وێزەی ئەو پەنجە بێ بەزەییانەی بە ئامێری بیستنەکانەوەن و لە سنگی منداڵەکەی دوور بخاتەوە .
بەڵام نەمتوانی .. دەمم نەکردەوە و دەستیشم نەجوڵاند .. هێشتا لەسەرمدا مێشک ماوە کە بڕوای بە زانست هەیە . خوداوەندی زانستی بەهێز بەزەیی ناناسێت ..

*　　*　　*

لەبەردەممدا بە قاچە ڕووتە خوار و خێچەکانیەوە ڕاوەستا کە بە موویەکی زۆر داپۆشرابوو سەیرێکی کردم و وتی : پانتۆڵەکەشم دانێم ؟ مامۆستاش بە چاوێکی توڕەوە سەیرێکی کردوو وتی : سەرجەم جلوبەرگەکەت دانێ !
نەخۆشەکە بە پەشۆکاوی لەمنی دەڕوانی و قایشی پانتۆڵەکەشی بەدەستەوە بوو ڕامابوو لە نێوان ترس و دوو دڵی .. مامۆستا هیچ بواری نەداو چووە لایەوە و پانتۆڵەکەی ڕاکێشایە خوارەوە ئیتر پیاوەکە لەبەردەمماندا تەواو ڕووت بوەوە ..
دەستکێشەکانم لەدەست کردوو لێی نزیکبومەوە .. پیاوەکە نەیدەزانی لە شەرمان چی بکات .. چۆن ئافرەتێک ڕووتی بکاتەوە و بیپشکنێت ؟! هەوڵیدا لێم دوربکەوێتەوە , بەڵام مامۆستا زڵلەیەکی وا قورسی ئاڕاستە کرد کە تەواو خۆی شل بکات بۆ پەنجە پشکنەرەکانم وەك لاشەیەکی مردوو .
خوداوەندی زانست بەزەیی و شەرم ناناسێت ..
چەند دڵ ڕەقە ! ئەشکەنجەی منیش چەند بەهێزە لە حزوریدا !
ئەو جەستە زیندووە ڕێز و هەیبەتی لەدەستدا .. لەچاومدا و لەژێر پەنجەکانمدا وەك مردووی لێهات . لە مێشکمدا بووە چەند پارچەیەك لە ئامێر و کۆئەندام .

*   *   *

شەو سارده و ترسناکه .. تاریکی ئارام و مردووه .. نەخۆشخانه گەورەکەش بە ڕووناکی و گڵۆپەکانیەوە وەك گورگ وایه له تاریکیدا .. هاوار و کۆکەی نەخۆشەکان پەردەی بێدەنگی شەوی دڕیووه .. منیش .. منیش لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەم وەستاوم .. بە تەنیا .. سەرنجی کردنەوەی ئەو گوڵ خونچه سپیه دەدەم له تەنیشتمەوە لەسەر پەنجەرەکە .. پەنجەمی لێدەدەم و له ناخمدا وا هەست دەکەم مردووم و بۆ یەکەمجاره هەست بە بەرکەوتنی شتێکی زیندوو دەکەم لووتم نزیك دەکەمەوە تا بۆنی هەڵالەکەی بکەم و وا هەست دەکەم زیندانیەکی هەتاییم و لوتی له شیشی تەنراوی پەنجەره ئاسنینەکەوە دەباته دەرەوە تا بۆنی ژیان هەڵمژێت .. دەستم برد بۆ گەردنم پەنجەکانم بەر سۆندەی ئامێری بیستنەکه کەوت که له گوێمدا وەك پەتی سێداره شۆڕ بونەتەوە .. چاکەته سپیەکەی بەریشم که بە جەستەمەوە لکاوه بۆنی کحول و ئەسیر و یۆدی لێ دێت .. ئاه ..

چیم له خۆم کرد ؟!

ژیانم بە نەخۆشی و ئازار و مردنەوە بەستەوە .. پیشەم بۆته ڕوتکردنەوەی جەستەی خەڵکی و بینینی عەیبەکانیان , برینەکانیان دەردراوەکانیان شی دەکەمەوە..

له ژیاندا جگه له نەخۆشی ڕاکشاو لەسەر جێگه هیچی ترم بەدی نەدەکرد .. بە گێژی یان بە هاوار و گریان یا بە لەهۆشخۆچویی .. چاوەکانیان لاواز یا زەرد یان سوور هەڵگەڕاو .. ئەندامەکانی جەستەیان یا سست یان لەکار کەوتوو .. هەناسەکانیان پچڕپچڕ .. دەنگەکانیان گڕ و ناتەواو یان نرکه و ناڵه ..

دەبێت تا ماوەیەکی دورودرێژ بەرگەی ئەم ژیانه بگرم .. بە درێژایی تەمەنم ؟!

هەستم بە گرژییەك کرد لەجۆری ئەو هەستەی کە زیندانییەك لە هیوای ئازادبونیدا هەیەتی ..
لە ژوورەکەم چوومە دەرەوە .. لە هۆڵە گەورەکەدا دانیشتم و گۆڤارێکی پزیشکیم گرت بە دەستمەوە تا بیخوێنمەوە , بەڵام هەر زۆر زوو بیرم چوو بۆلای قاوشی پزیشکەکان .. کە لەم کاتەدا پزیشکێکی هاوڕێم لەوێ نوستووە .. هەردوکمان شەومان کردووە بە دوو بەشەوە لە نێوانماندا .. ئەو شەش کاتژمێری یەکەم دەنوێت و من شەش کاتژمێری کۆتایی .. نازانم چۆن بەبیرمدا هات من چۆن لەم نیوەی شەوەدا لەگەڵ پیاوێکدا دانیشتووم تەنها دەرگای داخراوی ژوورەکەم جیامان دەکاتەوە .. ئەم داڵغەیەك وەك یەکێک لە داڵغەکانی شەو لا دروستبوو بەڵام من بەئاگام هەستم بە ترس کرد . نا .. ترس نیە .. بەڵکو خەمۆکی .. نەخێر .. خەمۆکی نیە .. بەڵکو حەزە .. نا .. حەزیش نیە .. بەڵکو هەستێکی ناخۆشی سەیرە کە وای لە چاوەکانم کردووە ناو بەناو سەرنجی دەرگا داخراوەکە بدەم .

*          *          *

لە تەنیشتم زەنگی تەلەفۆن لێیدا کە دەنگی پەرستارێکی ئێشکگر بوو داوا دەکات بە هانای نەخۆشێکەوە بچم ..
بەچاو تروکانێك خۆم گەیاندە یەکێک لە قاوشەکانی نەخۆشەکان و خۆم لە نزیك سیسەمێکدا بینیەوە کە نەخۆشێکی لەسەرە .. بوکێکی گەنج بوو .. ئامێری بیستنەکەم خستە سەر سنگی تا گوێبیستی لێدانەکانی دڵی ببم .. زمانەکانی دڵی قورس بوون . دەنگێکی ناتەواویان دروستکردبوو کە لە دەنگی دڵی ئاسایی نەدەکرد ..
زمانەکان لە بێهێزیدا تەواو دەرگاکانیان دانەدەخست هەربۆیە خوێن بە ناڕێکی هاتوچۆی دەکرد ..

سەرنجێکی ئافرەتە گەنجەکەمدا .. پرشنگی هیوام لە چاوەکانیدا بینی بەدڵێکی شادەوە پێی وتم : ناوی بنێم چی ؟ ئەوە یەکەمین کوڕمە .
لەوکاتەی خەریکبووم دەمامکی بەنجەکە بخەمە سەر دەمی و چاوەکانی بشارمەوە پێموت : نازانم .. ئێمە هێشتا نازانین کوڕت دەبێت یان کچ !
چەند ساتێک تێپەڕی .. چەند ساتێکی ناخۆش .. قژی ڕەشی منداڵەکەم بینی لە تاریکیەوە بەرەو ڕووناکی دێت و بە دوو گیرەی زانستی ڕەق گرتوومە .. ئامێری بیستنەکەم خستە سەر دڵی ئافرەتەکە بینیم دڵی لە هەوڵ و کۆششدایە .. خوێن بەخێرایی هاتوچۆ دەکات و زمانەکان شەققەیان دێت .. پاشان بینیم منداڵەکە بەخێرایی بەرەو دەرەوە دێت و هاوار دەکات و دەگری نیشانەی خۆشی بە ئاشکرا بە ڕوخسارمەوە دیاربوو کاتێک بینیم مرۆڤ چاوە بچکۆلانەکانی بۆ یەکەمجار لە ژیاندا دەکاتەوە و جیهانی بەرین بەدی دەکات.
بەڵام پاش چەند چرکەیەك هەستم بە بێدەنگیەکی ترسناك کرد وەك بێدەنگی ناو گۆر .. خووڕەی خوێن نەما زمانەکان لە لێدان کەوتن .. سەیرێکی ئافرەتەکەم کرد .. دەموچاوی بێدەنگ و سارد بوو وەك پەیکەرێکی لە گرانیت دروستکراو .. سنگی داتەپیوبوو نە بەرز دەبوەوە و نە نزم وەك سنوقێکی تەختە .. چی ڕوویدا ؟
کەمێك لەمەوبەر قسەی دەکردوو دەجوڵاو هەناسەی دەدا !
بەپەلە کەوتمە هەوڵدان بە هەرچی کەلوپەلێک کە زانستی پزیشکی پەی پێ دەبات بۆ هەڵگرتنەوەی ژیانی ئەو مرۆڤە لە لێواری تیاداچوون .. چەند جۆرێك لە ووشیار کەرەوەم بە دەرزی لە خوێنبەرەکانیدا .. ئۆکسجین و هەوام پاڵپێوەنا بۆ ناو لووتی .. هەناسەدانی دەستکردم تاقیکردەوە تاکو سیەکانی بجوڵێنم .. دەرزییەکی درێژم چەقاندە دڵی تا بجوڵێت .. کراسەکەیم لە سنگیدا

کردەوە و بە دەست یاریم بە دڵی دەکرد تاکو ژیانی بۆ بگەڕێتەوە .. بەڵام نەخێر .. هەموو شتێک بێسوودە .. نەزانست کەڵکی هەیە و نە تەندروستی .. هەموو شتێک دەستەوسانە .. دەستەوسانە لەبەردەم ئەوەی کە ئەم ئافرەتە چاوەکانی بکاتەوە ..

پاشان سەرنجی کۆرپەکەمدا بەدەست پەرستارەکەوە قاچەکانی دەجوڵێنێت و دەگری ..

ئایا ئەمە سەیر نیە ؟ جێگەی سەرسوڕمان نیە ؟ ئەم پارچە مرۆڤە زیندووە لەم لاشە مردووە بی جووڵەیە بووە کە لەسەر ئەم سیسەمە کانزاییە ساردە ڕاکشاوە !

دواتر سەرم شۆڕ کردەوە و .. لەسەر کورسیەکی نزیکی لای خۆمەوە دانیشتم بۆچی زانست دەستەوسانە ؟ ئەو خودا بەهێزەی سەرم بۆ دانەنەواند ! بۆچی دەستەوسانە لەبەرامبەر ئەوەی پێمبڵێت یان بۆم شی بکاتەوە کە چۆن زمانەکانی دڵ بەهۆی ڕۆماتیزمەوە تێکدەچن ؟

چۆن ئەو پرشنگە بچکۆلەیە لە ژیان دەچێتە ناو ئەو بابەتە مردووەوە ! چۆن ژیان دادەگیرسێت و چۆن دەکوژێتەوە ! لە چ جیهانێکەوە مرۆڤ دێت و بەرەو چ جیهانێك دەڕوات ؟! ..

ئەو ململانێیەی لەناخمدا بوو لە چوارچێوەی نێری و مێیی دەرچوو بەرەو مرۆڤایەتی گشتی ..

بینیم مرۆڤ پیس و لاوازە ویڕای ماسولکە و خانەکانی مێشکی و ئاڵۆزی خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی .

میکرۆبێکی بچووك کە بەچاو نابینرێت و بە هەوادا و لە ڕێگەی لوتەوە دەچێتە سیەکانەوە و بەخواردن دەیخوات ..

ڤایرۆسێکی نادیار لێی دەدات بێئەوەی تەنانەت بزانێت لە کوێوە دێت و وا لە خانەکانی جگەری یان سی دەکات تیایدا زۆر ببێت بڵاوبێتەوە بە ناوچەکەداو هەمووی بتەنێتەوە ..

تەنها دڵۆپێك لە خوێن دووچاری بەستن دەبێت لە یەکێک لە خانەکانی مێشکیدا کە وا دەکات دواجار ئەو مرۆڤە لەسەر جێگەکەی بەبێ جووڵە بوەستێت .
کردنی دەرزییەك بە بچوکترین پەنجەیدا بیستن و بینین و توانای قسەکردن ناهێڵێت .
تەنها بڵقێکی بچووك لە هەوا تێکەڵ بە خوێنی ببێت دەبێتە لاشەیەکی بێ کەڵك وەك لاشەی ئەسپ و سەگ بۆگەن دەکات و خۆی دەخواتەوە .
ئەم مرۆڤە خۆ بەزلزانە بەهێزە .. کە لە جووڵە و سەرقاڵی و داهێنان ناکەوێت .. ئەم مرۆڤە جەستەیەك لەسەر زەوی هەڵیگرتووە کە لە نێوان ئەو و لەناوچوندا تەنها هێندەی تاڵێک ماوەیانە .. گەر بچڕا .. کە هەر دەبێت بپچڕێت .. ئەوا ئەوکات هیچ هێزێک نیە لە جیهاندا بتوانێت لێکی بداتەوە ..
زانست لەسەر عەرشەکەی کەوتە خوارەوە بۆبەردەمم بەخێرایی و پەشۆکاوی و ڕووتی و دەستەوسانی وەك چۆن پێشتر پیاو کەوت پاشان بەملاولامدا ڕوانیم بە خەمۆکیەکەوە.. زانست باوەڕی کۆنی شکاندم نەیگەیاندمە هیچ باوەڕێکی نوێ. دواتر زانیم کە ڕێگەی مێشک وەك بڕیارمدابوو بیگرمە بەر ڕێگەیەکی ناهەموار و کورتە لە کۆتاییەکەیدا بەربەستێکی گەورە هەیە .. چاوم کردەوە .. چی بکەم باشە ؟
ئایا بگەڕێمەوە بەرەو دوا ؟ یان لەپاڵ ئەم بەربەستەدا بوەستم و خۆمی لەپاڵدا بپارێزم ! هیچ بوارێکی دەستنیشانکردنم نەمابوو .. چونکە بەگژداچوون و بەرەنگار بوون و بەرهەڵستی جۆرێك لە هێز و توانای پێ بەخشیبوم کە نەمدەتوانی بەهۆیانەوە لەپاڵ هیچ شتێک یان بەهۆی هیچ شتێکەوە خۆم بپارێزم .. چ جای گەر ئەو شتە بەربەستێکی گەورە بێت و هیچ دەرچەیەکی نەبێت .. پاشان هەستمکرد قاچەکانم بەرەو گرتنەبەری ڕێگەیەکی نوێم دەبات .

* * *

شتومەکێکی کەمم کۆکردەوە و سواری شەمەندەفەر بووم تا دوورم بخاتەوە لە شار .. دوور لە مامۆستایانی زانست و کارگەکانی .. دوور لە دایکم و کەسوکارم .. دوور لە پیاوان و ئافرەتان .
لە یەکێک لە گوندە دوورە بێ دەنگەکاندا خانویەکی بچکۆلانەم دەستنیشانکرد تا تیایدا نیشتەجێ ببم ..لە تارمەی خانووە گوندیەکەمدا دانیشتبووم چاوم دەگێڕا بە کێڵگە سەوز و بەرینەکاندا و لەوێوە چاوم و سەرنجم دەگواستەوە بۆ شینایی ئاسمان .. تیشکی خۆریش بە گەرمی دەکەوتە سەر جەستەی درێژ بووم لەسەر قەنەفە دارینەکە .. هەستم بە قورسی و خاوبونەوەی جەستەم کرد .. بۆ یەکەمجارە بەتەنها لەگەڵ خۆمدا دابنیشم ..
هەستمکرد سەرجەم جلوبەرگە کەڵەکە بوەکانی چەندین ساڵەی ژیانم دادەکەنم خۆم بەبێ جلوبەرگ بینیەوە .. تەواو ڕووت .. پاشان کەوتمە پشکنینی جەستەم ..
نەشتەرم بە دەستەوە نەبوو .. ئامێری بیستنیشم لە گوێدا نەبووم و لە هەموو شتێک دوور کەوتبومەوە .. دوور کەوتومەتەوە لە زانست و پزیشکایەتی .. دوورم لەو ساڵانەی تیایدا ژیابووم .. لەو خەڵکانەی بینیبومن و دەمناسین .. لەو ململانێیانەی گوشیمی و ڕادەستی ئەو بەربەستەی کردم کە هاتە بەردەم بیرکردنەوەم .. بیرکردنەوەشم وەلا نا .. پاشان هەستمکرد بۆ یەکەمینجارە لە ژیانمدا هەست بکەم بێئەوەی بیر بکەمەوە هەست بە بەرکەوتنی گەرمی تیشکی خۆر دەکەم بۆ سەر جەستەم .. هەست بەو سەوزاییە بێدەنگە جوانە دەکەم کە زەوی داپۆشیووە . هەست بەو بەرگە شینە ناسکە دەکەم کە کراوە بە بەر ئاسماندا . بۆ یەکەمجارە لە ژیانمدا لەگەڵ سروشتدا ڕووبەڕو دەبمەوە . بۆ یەکەمجاریشە ڕوخساری بە جوانی و سیحراوی بەدی دەکەم کە هیچ شتێک ناتوانێت تێکی بدات

.. قەرەباڵخی و وشکی شار نایشێوێنێت .. هەروەك مێینەیی بێ کەڵکی دیل ناتوانێت بیشێوێنێت .. هەروەها پیاوێتی پیاوی لەخۆبایی خۆ سەپێن .. یان زۆر بلێی زانستی دەستەوسان .. توانیم بزانم کە سروشت خودایەکی بەهێزی جوانە مرۆڤی لەخۆبایی و لاواز دەیەوێت جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگی لەبەر بکات و لە گرنگی و توانای کەمبکاتەوە و ناشرینی بکات تەنها لەپێناو ئەوەی خۆی قایل بکات کە ئەو لەو تەمەنە کەمەی توانیویەتی شتێک بکات .. هەر شتێک بێت .

هەستمکرد دڵم لێدەدات و لێدانەکانی ناخم پڕ دەکات لە وزەی سۆز و بەزەیی سەیر سەیر ..

بۆ یەکەمجارە دڵم لێ بدات و هەست بکەم بیر بکەمەوە .. بێئەوەی لەگەڵ لێدانەکانیدا مێشکم تابلۆی دڵ بکێشێت و خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی و خوێنی ناوی پەستانەکانی بێتە پێشچاوم ..

ئێستا لێدانەکانی دڵم زمانێکی نوێی هەیە هەر گیز زانست یان زانستێکی پزیشکی ناتوانێت گوزارشتی لێ بکات .. زمانێك تەنها دەتوانێت بە هەستە شاراوەکانی ناخم لێی تێبگەم و هەرگیز ناتوانم بەبیر کردنەوەی ئاسایی مێشکی بەتەمەنمدا لێی بگەم .

هەستمکرد سۆز ژیرترە لە مێشک و چەسپیوترە لە دڵداو پەیوەندی دێرینترە بە دیرۆکی لە مێژینەی دووری و زیاتر ڕاستگۆ و خاوەن ئەزموونە لەگەڵ سروشتی و مرۆڤایەتیدا .

زیاتر خۆم شلکرد لەسەر قەنەفەکە و قاچەکانم تەواو بڵاوکردەوە و خۆمدایە دەست سۆزی گەرمم تا ختوکەی جەستەم بدات .

بەئاگا هاتم .. ئەوە ئەو جەستەیەیە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان سزای سێدارەم بەسەردا سەپاند .. جەستەی ئافرەتی مێینە کە بە سەربڕین سەرمبڕی لەبەرپێی خوداوەندی زانست و مێشکدا .. ئەوە جەستەمە سەر لەنوێ ژیان دێتەوە بە بەریدا .

بۆم دەرکەوت کە من تەمەنم بە فیڕۆداوە لە ململانێیەکدا کە زەوی نیە .. منداڵی و هەرزەیی و هەڕەتی لاوێتیم لە جەنگێکی سەختدا بەفیڕۆداوە .. لە دژی کێ ؟ لە دژی خۆم .. لە دژی مرۆڤایەتیم .. لە دژی غەریزەم .. لە پێناو چیدا ؟ هیچ شتێک .. ئەوەتا من لە هەموو شتێک دوور دەکەومەوە و سەر لە نوێ دەست پێدەکەمەوە .. لە سەرەتای ژیانەوە دەست پێدەکەم .. لە زەوی ئاساییەوە دەست پێدەکەم کە سەرەتاییە و خۆ ڕسکانە گەنمی تیادا دەڕوێت .. لە سروشتی سەرەتاییەوە دەست پێدەکەم کە بەرگی زەوی ملیۆنان ساڵە داپۆشیووە .. لە مرۆڤێکی دەشتەکی گوندنشین دەست پێدەکەم کە سادەیە و گژوگیای زەوی دەخوات و غەریزەی لەژێر دار و دەوەندا پیادە دەکات و دەخوات و دەخواتەوە و نەخۆش دەکەوێت و نەوە دەخاتەوە و لەناو دەچێت و دەمرێت بێئەوەی بپرسێت بۆچی و چۆن ؟

زەردەخەنەیەك گرتمی .. پاشان پێکەنیم .. بە دەنگێکی هێندە بەرز پێکەنیم گوێم لە دەنگی خۆم بوو پێکەنینەکە لەسەر لێوەکانم دەچووەوە یەک و دەمرد بێئەوەی گوێبیستی دەنگی ببم .. دایکم هەمیشە پێی دەوتم کە نابێت کچ بە دەنگی بەرز پێبکەنێت بەشێوەیەك خەڵکی بیبیستێت.

دواتر تەواو دەمم کردەوە و پڕ بە دەمم قاقام لێدەدا .. هەوایەکی زۆر چووە سنگمەوە هەوایەکی خاوین نە دوکەڵی تیادا بوو نە کاربۆن نە زانستی پزیشکی و نە داب و نەریتی کۆمەڵگە .

هەوایەك پێکهاتە و ناوەرۆکیم بە خەیاڵدا نایەت بەڵام هەست دەکەم کە هەوایەکی خۆشە ناخی گەرمم شێدار دەکات .. خۆم دایە دەست تیشکی خۆر و لێیگەڕام بکەوێتە سەر جەستەم .. تیشکێکی خاوێنی بێگەرد شیکارەکانی زانست نایکاتە تیشکی وەنەوشەیی یان سووری سوتێنەر یا پێچەوانەیی و تێکی بدات. پاشان پیاوە گوند نشینە سادەکە بە خۆیی و سینیەك خواردنەوە هاتە لام .. کولێرە و پەنیر و

کەرە و هێلکە .. دەستمکرد بە خواردن حەزم بۆ ئەو خواردنە وەك حەزی منداڵیم وابوو لە خواردندا .. ئامۆژگارییەکانی دایکمم بیرچۆوە کە کچ چۆن نان دەخوات .. ئاگادارییەکانی تەندروستی پزیشکیم وەلانا لە خۆپاراستن لە پەنیر و کەرە .. دەمم پڕ پڕ کرد لە خواردن .. لە ئاوی گۆزەی لە قوڕ دروستکراو ئاوی ساردم کرد بەسەریدا بە دەنگی بەرز تنۆکی ئاوەکە لەنێوان لێوەکانمەوە هاتە خوارەوە و جلەکانی بەری تەڕ کردم ..

هێندەم خوارد تا تێر بووم و ئاوی باشیشم خواردەوە تا ڕاستبومەوە پاشان قەنەفەکەم جێهێشت و لەسەر زەوی شێدار ڕاکشام .. ڕوخسارم کردە سەر خۆڵەکە و بۆنی ناخی زەویم دەکرد بڕوابوون و هەستم پتەوتر دەبوو بەوەی کە من لە زەویم و بۆ زەویم .

پاشان شنە بایەکی خۆش و ناسك هات و کراسەکەی لەسەر قاچەکانم لادا .. منیش وەك جاران نەترسام کاتێک کە قاچەکانم ڕووت دەبوون . دایکم چۆن توانیویەتی ئەو هەستە هەڵەیە لە ناخمدا بچێنێت کە جەستەم عەیبەیە ( عەورەتە ) ؟ مرۆڤ بە ڕووتی لەدایك دەبێت و بە ڕووتیش دەمرێت , ئەو جلوبەرگەش کە دەیپۆشێت ڕووکەشە و ڕاستیەکانی پێ دەشارێتەوە .

لێگەڕام تا بە تەواوی هەوا هەڵێدامەوە .. لەو ساتەدا هەستمکرد سەرلەنوێ لەدایکبومەوە و لەگەڵمدا سۆز و هەست لەدایکبوو ..

بەڕاستی ئێستا لەدایکبووم , بەڵام بە پتەوی و بەهێزی لەدایکبوم و دەمەوێت بژیم و داوای مافی ژیان دەکەم .. لە نیوەی شەودا گوێم لە لێدانێکی بەهێزی دەرگای دەرەوە بووم.. بینیم چەند جوتیارێک پیاوێکی بەساڵاچووی نەخۆشیان پێیە ..

دەرگام لێکردنەوە و چاکەتە سپیەکەم لەبەرکردوو ئامێری بیستنم خستە سەر سنگی کابرای نەخۆش ..

لەگوێمدا لێدانی دڵ تێکەڵ بە نرکە نرکێك بوبوو سەرم هەڵبڕی و سەرنجێکمدا .. بینیم چاوەکانی کابرا سەرنجی چاوەکانی من دەدەن

وەك نوقومبویەك لەکاتی مردندا هەوڵی خۆ هەڵواسین دەدات بە هەر شتێک کە ڕزگاری بکات .
بەڵام وەك ئەوەی زانستی پزیشکیم بیرچوبێتەوە .. وەك ئەوەی ئەمە یەکەمینجارە نەخۆشێك ببینم و بیپشکنم .. وەك ئەوەی یەکەمجارە لە ژیانمدا چاوم بکەوێت بە مرۆڤێک لە ناڕەحەتیدا بێت وەك ئەوەی یەکەمجارمە گوێبیستی ناڵە و نرکە ببم .
من چۆن بە درێژایی ساڵانی ڕابردوو نەخۆشم دەپشکنی ؟ مامۆستایانی پزیشکی چۆن توانیویانە ئەوەم لا بچەسپێنن کە نەخۆش تەنها بریتیە لە جگەر و سی و کۆمەڵێك دەماری خوێنبەر و خوێنهینەر ؟ چۆن توانیان وام لێبکەن کە کاتێک سەرنجی دوو چاو دەدەم تەنها ئامێری پشکنەرەکەم ئاڕاستە بکەم و پێڵوەکانی بە پەنجە هەڵبگێڕمەوە ! چۆن توانیان وام لێبکەن دەمی خەڵکی بکەمەوە و لێی بڕوانم بێئەوەی گوێبیستی نرکە و ناڵەی ببم ؟ هەستم بە تەوژمێك کرد ناخم دەهەژێنێت.
بۆ یەکەمجارە هەست دەکەم نەخۆش مرۆڤێکی تەواوە .. یەك پارچەی یەکگرتوو .
یەکەمجارە تێڕوانینی هیلاکی و نەخۆشی سنوری چاوەکانم دەیبڕێت و دەچێتە ناخمەوە ..
یەکەمجارە دەنگ نرکە و ماوەی نێوان گوێ و دڵم دەبڕێت .. گوێچکەکانم بەبێ دەنگی گوێبیستی هەنسکەکانی و نرکەی بەهێمنی دەبن و سەرنجی تابلۆی ناڕەحەتی و ناهەمواری مرۆڤایەتی و سەرسوڕهێنەر دەبن .. مێشکیشم ئارام وەستاوە هەوڵدەدات واتای ژیانی نوێ تێبگات .
دەستم خستە سەر دڵم وسەرم نا بە دیوارەکەوە .. شتێک لە هەردوو چاوە لاوازە سستەکاندا وا دەکات دڵم سست ببێت .. شتێک لە دەنگی نرکەکاندا وا لە ناخم دەکات ورەی نەمێنێت .. شتێکی سەیر پێشتر نەمناسیووە .. هەستم پێ نەکردووە .. نەمچەشتووە ..

ئازار ! بەڵێ ئازار ..
یەکەمجارە لە ژیانمدا ئازارم پێبگات .. هەستێکی بەئازار .. بەڵام قووڵ .. قووڵ .. دەرباز بوو بەرە و قوڵایی ناخم تا گەیشتووە بە چێژ ..
ئازارم پێگەیشت بەڵام هەستم بە چێژی ئازارەکە نەکرد .. هەستمکرد بە چێژی مرۆڤایەتی کاتێک پیادەی هەوڵە شکستخواردوەکانی دەکات و دووریە شاراوەکانی دەپشکنێت.. وەك ئەوەی ناخم هەستی بە چێژکردن وەك شیلەیەك خواردبێتەوە .. وەك ئەوەی ڕۆحم هەستکردنی بەئازار هەڵمژیبێت . هەستم بە سەرگێژ خواردن کردوو خۆم هاویشتە سەر یەکێک لە کورسیەکانی نزیکم و چاوەکانم لێکنا .. گریام .. گریام وەك ئەوەی هەرگیز نەگریابم .. وەك ئەوەی چاوەکانم پێشتر فرمێسکیان نەناسیبێت .. فرمێسکە گەرمە پەنگخواردوەکانم وەك زریانێکی پتەو هوروژمی هێناو داباری.
لێکدانەوەکانم جێهێشت بۆ فرمێسکەکانم .. لە ڕێگەیاندا نەوەستام .. بابگریم هەرچۆنێك فرمێسکەکانم دەیانەوێت .. با مێشکم بشۆمەوە لەو تەمومژە چڕەی کەڵەکە بووە و ئەو پەردە تاریکەش لەسەر دڵم لادەم .. تا ڕۆحم لەو گرتوخانە ئاسنینە ئازاد بکەم .. خۆمدایە دەست ئازار ..
لە دەنگێک بە ئاگا هاتم دەنگێکی لاوازی لێڵ بەڵام گەرم .. گوێم لێبوو دەیوت : دکتۆرە مەگری .. من باشم .. چاوەکانم کردەوە و سەرنجمدا . زەردەخەنەیەکم لەسەر ڕوخساری هەست پێکرد .. زەردەخەنەیەکی هێمنی ئاسودەیی بەخش بەڵام لە ناخیدا هەڵگری سۆز و بەزەیی بوو ..
وەك ئەوەی ئەو بەزەیی بە مندا بێتەوە .. وەك ئەوەی ئەو بیەویت دەستم بگرێت و هاوکاریم بکات .. وەك ئەو زانست و تەندروستی هێزی پێبێت و من هیچ شك نەبەم .

وەك ئەوەی عیللەتی جەستە هێور بوبێتەوە لەچاو عیللەتی ڕۆحدا و دواجار هەست دەكەم ئەو پزیشكە و منم نەخۆش . هەرگیز بڕوام نەمابوو لەو ساتەدا كە بڕوابوونم بە مرۆڤ لەدەستدابوو وا هەستم دەكرد كە تۆپەڵێك هەوا لە ئەو و لە ژیانی بەهێزترە و جارێكیتر و سەر لەنوێ متمانە و بڕوای پێدەهێنمەوە .
لەو بڕوایەدا نەبووم كە متمانەم بە مرۆڤ لەدەست دەدەم لەكاتێكدا من لە نێوەندی شارێكدام پێشكەوتوو و گەشاوەیە بە شارستانی و بیناسازی و فڕۆكە و بۆمبەكانی , پاشان دەگەڕێمەوە و متمانە و بڕوای پێدەكەم لە ئەشكەوتێكی چۆڵی تاریكدا .
بڕوام نەبوو كە متمانەم بە مرۆڤ لەدەست بدەم لە كاتێكدا من لەنێوان مامۆستایانی پزیشكی و خەڵكانی زانادام , پاشان دەگەڕێمەوە و بڕوای پێدەكەم لەسەر دەستی كابرایەكی گوندنشینی بەساڵاچووی نەخۆش كە تەنها دشداشەكەی و زەردەخەنەكەی شك دەبات .. زەردەخەنەیەكی بچووك لەدوو لێوی وشكهەڵاتوەوە بەڵام لە شەپۆلەكانیدا پڕ واتای ژیانە .. ئەو واتایەی لە قەرەباڵخیدا لە خەڵكی وون دەبێت ئەو واتایەی زانست بیری دەچێت لە نێوەندی تەقە و ڕەقە و قەرەباڵخی ئامێرەكاندا و مێشک ناتوانێت هیچ شتێكی لەبارەوە شیبكاتەوە.. خۆشەویستی .. خۆشەویستی ژیان بەهەموو چێژ و ئازارەكەیەوە .. لە تەندروستی و نەخۆشی .. لە دیار و نادیار .. لە سەرەتاو كۆتایی ..
خۆشەویستی ؟!
دڵم بۆ ئەو ووشە نوێیە لێیدا .. گرژییەك هات بە ئەندامەكانی جەستەمدا .. شەماڵی سۆز بە هەموو جەستەمدا هات و دڵم گڕی گرت ..

* * *

ئێستا چۆن دەتوانم بژیم ؟

من ئەو منداڵەی هێشتا لە سۆزی منداڵیمدا , من ئەو پزيشكە بە ئەزموونەی مێشكی بە تەمەنم ؟
بيست و پێنج ساڵ لە تەمەنم تێپەڕيكردووە بێئەوەی بۆ تەنها ساتێك هەست بكەم كە ئافرەتم ! بێئەوەی تەنها جارێك دڵم بۆ پياو لێبدات ! بێئەوەی لێوەكانم بەر ئەو شتە سەرسوڕهێنەرە بكەوێت كە پێی دەوترێت ماچ ! بێئەوەی ئەو ماوە گڕ گرتووە هەست پێ بكەم لە تەمەنی مرۆڤی تازە پێگەيشتوودا .
منداڵيم لە ململانێم لەگەڵ دايكم و براكەم و خودی خۆمدا تێداچوو .. كتێبەكانی زانست و پزيشكايەتی و پێگەيشتويی و دەستپێكی لاوێتيمی لووشدا .. ئێستا ئەوەتا منداڵێكم لە بيست و پێنج ساڵی تەمەنيدا .. منداڵێك دەيەوێت ڕابكات و ياری بكات و خەڵكی خۆشبوێت ..

*     *     *

كەلوپەلەكانم كۆكردەوە و سواری شەمەندەفەر بووم تا دوور بكەومەوە .. هەستمكرد زياد لە پێويست بە ژيانەوە وابەستە و لكاوم هێندە پێويست ناكات بەو شێوە توندە ببەسترێمەوە .. ئەو ژيانەی كە واتای بوونی لە زەويەوە وەرگرتووە وەك چۆن كۆترێك بە دەنووكی دەنكە گەنمێك لەسەر زەوی هەڵدەگرێت .. من ژيانم خۆشدەوێت .. ئيتر چۆن دەتوانم خودی خۆم لەو تەنياييە ترسناكەدا بەند بكەم ؟
پێويستبوو بگەڕێمەوە .. گەڕامەوە .. گەڕامەوە بۆ ماڵەكەم و بۆ لای كەسوكار و كارەكەم و نۆڕينگەكەم .. باوەشمكردەوە بە ژيان و باوەشمكرد بە دايكمدا , بۆيەكەمجارە هەست بكەم كە ئەوە دايكمە .. باوەشمكرد بە باوكمدا هەستم بە كچێتی خۆمكرد .. پاشان باوەشمكرد بە براكەمدا و هەستم بە واتای خوشكوبرايەتی كرد .. بەملاولای خۆمدا گەڕام وەك ئەوەی بەدوای شتێكدا بگەڕێم ..

شتێک کە کەموکوڕییەکی زەقە .. کەسێک کە هێشتا لێم وونە .. دەبێت کێ بێت ؟ .. ناخم بانگی دەکات .. ڕۆحم ناوی دەبات .. دەبێت کێ بێت ؟ کێ ؟!

*     *     *

حەز و سۆزێکی زۆر جەستە و ڕۆحم دەهەژێنێت .. سۆزێک کە تینوی خۆشەویستیە و مێشک سەربەست و ئازادی کردووە .. سۆزی جەستەیەکی تازە پێگەیشتووە کە وا تازە لە بەندیخانەیەکی ئاسنین ئازاد بووە ..
ئایا دەبێت چاوپێکەوتنی نێوان ئافرەتێک و پیاوێک چی بێت ؟!
شەوگار درێژبوو .. سەراب و داڵغەکانیش شەوانە لەدەوروبەری سیسەمەکەم سەرەتاتکێ دەکەن ..
قۆڵێکی درێژی پتەو لێم دەئاڵێت و .. ڕوخساری پیاوێک هێدی هێدی لێم نزیك دەبێتەوە .. دوو چاوی هەیە لە چاوەکانی باوکم دەکات .. دوو لێوی هەیە لە لێوەکانی کوڕی مامەکەم دەکات .. بەڵام نە باوکمە و نە کوڕی مام .
ئایا دەبێت کێ بێت ؟ ووتە و باسەکانی کچان و سەردەمی قوتابخانە دەستی گرتووە بەسەر تەواوی بیرمدا .. هەناسە هەڵکێشانەکان و لێو گەستنەکان .. خەونی تازە پێگەیشتوان , هەرزەکاران ..
وەك ئەوەی من جەستەی پیاوم شیکار نەکردبێت .. وەك ئەوەی بێ جلوبەرگ و بە ڕووتی پیاوم نەبینیبێت ؟ وەك ئەوەی پیسی و ناشرینیم بەدی نەکردبێت !
دەبێت بیرم چوبێتەوە ؟ نازانم .. بەڵام بیرم چۆتەوە .. پاشان سیحر و نامۆیی گەڕایەوە جەستەی زیندوو .. چۆن لەبیرم چووە ؟! .. لەوانەیە مێینەییم کاتێک لە بەندیخانە ڕزگاری بووە زۆر بە قورسی و پەرۆشی لە ڕێگە گرتنیدا سەرجەم بیرەوەرییەکانی مێشکی وەلا ناوە .. یان پێدەچێت سۆزی هەرەس هێنەری ناخم تابلۆی ناشرینی

جەستەی سڕیبێتەوە .. یان لەوانەیە ڕاپەرینی دڵ شۆڕشی تەواوی بەسەر زانستی پزیشکیدا ئەنجامدابێت لە مێشکمدا ..
ڕۆژ نابێتەوە و .. گەرمی ناو جێگەکەشم بۆتە دۆزەخ و سەراب و دالْغەکانی شەویش , ڕووناکی توانای پەرشکردنی نەبوو .

* * *

لە نزیك سەرمەوە زەنگی تەلەفۆن لێیدا نیواونیو پێڵوەکانم بەرزکردەوە ڕوانیمە کاتژمێرەکە .. کاتژمێر دووی بەرەبەیان بوو .. ئامێرەکەم بە تەمبەڵیەکەوە بەرزکردەوە دەنگێکی پەشۆکاوم هاتە گوێ دەیووت :

- دکتۆرە دایکم لە مردن ڕزگار بکە ..

خێرا لەناو جێگە گەرمەکەم هاتمە دەرەوە و پاڵتۆکەم لەبەرکردوو جانتا ئامادەکراوەکەم هەڵگرت کە تایبەتە بە حاڵەتی کتوپڕ و سواری ئوتومبیلەکەم بووم و بەرەو ماڵی نەخۆشەکە بەڕێکەوتم .
ئامێری ( بیستەر / سەماعە ) پزیشکیەکەم خستە سەر دڵی .. لێدانێکی سستی خاوم بیست .. لێدان و ترپەی دڵی بەساڵاچوویەك کە لە حاڵەتی خڵەفاندایە و خەریکە ژیان لە دەست دەدات .
ئامێرەکەم لە گوێم کردەوە و بەملاولای خۆمدا ڕوانیم .. هەستم بە پیاوێکی درێژکرد لە نزیکم وەستاوە و چاوەکانی پڕ سەرنج و گومانن .
لێی پرسیم : دکتۆرە بارودۆخەکەی ترسناکە ؟
بێئەوەی وەلامی بدەمەوە لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و ئەویش بەدوامدا هات .. لە هۆڵی ماڵەکەدا وەستام هاتە بەردەمم و دوبارە لێی پرسیم : دکتۆرە مەترسی هەیە ؟
بەبێدەنگی پێوت : نەخێر .. ترسی نیە .. تەنها دەمرێت ..
تێڕوانینێکی سەیر چاوەکانی پڕ کردوو بە نیگەرانیەکەوە وتی :
دەمرێت ؟ نا ! نابێت !

سەری داخست و دەستیگرت بە نیوچاوانیەوە و لەسەر کورسیەك لەو نزیکە دانیشت و بەبێدەنگی دەستیکرد بە گریان. چاوەڕێمکرد تا کەمێك لە هاڵاوی گەرمی ناخی بڕێژێت پاش ئەوەی سەری بەرزکردەوە و سەرنجیدام پێموت :

- هەموو خەڵکی دەمرن .
- بەڵام ئەوە دایکی منە دکتۆرە .
- ئەو ئەوەتا خڵەفاوە و وڕێنە دەکات ئاساییە گەر نەمرێت , چاوی سڕی و دەستمبرد تەوقەم لەگەڵ کردوو وتم :
- لێی بگەڕێ با لە ژوورەکەی خۆیدا بە هێمنی ماڵئاوایی بکات . جارێکیتر فرمێسك هەرەسی هێنا و منیش دەرگاکەم کردەوە و چوومە دەرەوە .

* * *

لە نۆڕینگەکەم دانیشتبووم و پەرداخێك شەربەتی یانسۆن لە دەستمدا بوو کە پەرستارەکە بە دەرچوونی دواهەمین نەخۆش لە نۆڕینگەکەم بۆم ئامادە دەکات . پەنجەکانم بە دەوری پەرداخە گەرمەکەوە بوو هەوڵمدەدا کەمێك بحەوێمەوە . پاشان وورده وورده ڕوخساری هیلاک و ماندووم لە هەڵمی بەرزبوەوەی پەرداخە یانسۆنەکە نزیك دەبوەوە کە هێندەی حەزم بە هەڵمژینی بۆن و بەرامەیەتی هێندە حەز بە چەشتنی ناکەم .. دواتر پەرستارەکە هاتە ژوورەوە و پێ وتم : کە پیاوێک هاتووە و دەیەوێت چاوی بە من بکەوێت .. پیاوەکە هاتە ژوورەوە .. ناسیمەوە .. هەستامە سەرپێ و تەوقەم لەگەڵ کردوو لەبەردەممدا دانیشت .. سەرنجی بۆینباغە ڕەشەکەیمدا پێموت : بۆ خۆت خۆشبیت .

بە پەژارەیەکەوە وتی : سوپاست دەکەم دکتۆرە .

ئەو بەبێدەنگی مایەوە و منیش قومێکم لە یانسۆنەکەدا سەری بەرزکردەوە و سەرنجی پەرداخەکەیدا لێم پرسی : پەرداخێك یانسۆن ناخۆیتەوە ؟

بەسەرسوڕمانیکەوە سەیری کردم و وتی : یانسۆن ؟

پێکەنیم بەسەرسوڕمانەکەیی و ئەویش زەردەخەنەیەك گرتی و وتی :

- هاتووم سوپاست بکەم .
- هیچم نەکردووە .
- بەو کاتە درەنگە لە ماڵی خۆت هاتیتە دەرەوە .
- ئەوە ئەرکی پزیشکە .
- ڕاستیت پێ وتم .
- ئەو ڕاستیە ناتوانرێت بشاردرێتەوە .
- بەڕاستی شتێکی بە ئازارە .

وەڵامم نەدایەوە . پاشان سەیرێکی کردم و وتی :

- ئازارت پێناگات کاتێک مرۆڤێک دەبینی دەمرێت ؟
- ئەوە هێمنترین ئازارە لە ژیانمدا .
- چیبێت لە مردن بەهێزتر ؟
- نەخۆشیەك کە دەرمانی نەبێت .. پەك کەوتویەك کە چاکبونەوەی نەبێت .. ئەو ئاڵۆزی و لادانەی ڕووبەڕووی جەستە و مێشکی مرۆڤ دەبێت .
- ئەمانەت هەموو بینیووە ؟
- ئەمە ژیانی من و هەر پزیشکێکی ترە .
- دکتۆرە بمبورە .. من لەگەڵ مرۆڤدا مامەڵە ناکەم کە ڕووبەڕووی نەخۆشی و مردن بێتەوە .. من لەگەڵ بەرد مامەڵە دەکەم .
- ئەندازیار ؟
- بەڵێ .

کەمێك بێدەنگ بوو و پاشان پێوموت :

- تۆ ئازارت نەناسیووە .
- یەکەمجارە لە ژیانمدا مرۆڤێک ببینم بمرێت .. یەکەمجاریشە لە ژیانمدا بگریم ..

بەڕاستی شتێکی ناخۆشە ! ژیان سەختە .. سەختتر لە بەرد !

- بۆ هێشتا ژیانت نەناسیووە ؟

چاوێکی بڕییە چاوم و ویستی شتێک بڵێت بەڵام نەیوت .. وا هاتە پێشچاوم کە تێڕوانینێکی سەیرم لەسەرنجەکەیدا بینی .. لەوانەیە تێڕوانینێکی نەرمی پاکی منداڵانە بێت کە بیەوێت داوای شتێک بکات وایلێکردم حەز بکەم شتێک بکەم لە پێناویدا..

هەستایە سەرپێ و دەستی بۆ درێژکردم و وتی :

- دووبارە سوپاست دەکەم دکتۆرە .

پشتی تێکردم و بەرە و دەرگاکە چوو بەڵام نەچووە دەرەوە لایکردەوە بەلای مندا هەستمکرد هەوڵێکی زۆر دەدات و دەیەوێت شتێکم پێبڵێت .. گوێم لێیبوو دەیوت :

- دەمەوێ جارێکتر قسەت لەگەڵ بکەم بەڵام .. بێدەنگ بوو پاشان بێئەوەی سەیرم بکات وتی :
- دەزانم کاتت کەمە بەڵام ..

وەڵامم نەدایەوە .. پاشان وتی :

- دەتوانم جارێکیتر بتبینم ؟

سەرنجێکی چاوەکانیمدا ..

لەچاوەکانیدا تێڕوانینێک هەیە بۆ دوورم دەبات بەڵام هەڵسوکەوت و نەرمی پەشیمانم دەکاتەوە .. ئەو تەنها مردنی دایکی بینیووە و ئایا دەشێت ئەم مێشکە بەتەمەن و بە ئەزموونە قایل ببێت ؟ .. ئازار و نەخۆشیشی نەناسیووە .. ئایا دەشێت ئەم منداڵە چاو لە ئاسۆ بێسنوورە نەرمە کاریگەری هەبێت ؟

بەڵام ئەو یەکەمین پیاوە کە چاوم پێی کەوتبێت ..

وتم : دەتوانیت جارێکیتر بمبینیت ..

*     *     *

لەسەر بەردێکی گەورەی لای بەردەکانی هەرەم لە تەنیشتیەوە دانیشتم و سەرنجمدایە ئاسمان و خۆری سوور هەڵگەڕاو کە سەرەتاتکێ دەکات لەنێوان هەورەکانەوە گوێم لێبوو دەیوت :

- دکتۆرە بیر لەچی دەکەیتەوە ؟
- بۆچی بەردەوام بە دکتۆرە بانگم دەکەیت ؟
- ئەم نازناوەت خۆشناوێت ؟
- ناڵە و نرکەی نەخۆشیم بیردێنێتەوە .
- نازناوێکی سیحراوییە .. وا هەست دەکەم کە بانگت دەکەم شانازییە .. تۆ یەکەمین پزیشکیت کە ناسیبێتم .
- بەڕاست ؟!
- کاتێک بە تەلەفۆن داوام لێکردێت بێی بە هانای دایکمەوە بڕوام نەکرد کە دەنگت دەنگی پزیشك بێت کاتێکیش کە هاتیتە ژوورەوە بڕوام نەدەکرد تۆ پزیشك بیت .
- بۆچی ؟
- من وای بۆ دەچووم کە پزیشك پێوستە ناشرین یان بەتەمەن بێت .

چاویلکەیەکی ئەستووری سپی لەچاودا بێت پشتی چەماوە بێت لە ئەنجامی خوێندنەوەی زۆر .. هەرگیز بڕوام نەدەکرد کە دەشێت پزیشك ئافرەتێکی جوان بێت .

- بۆچی ؟
- قورسە ئافرەت بتوانێت مێشک و جوانی لای خۆی بە هاوسەنگی ڕابگرێت .
- بۆچی ؟
- نازانم .

- لەبەرئەوەی هەر لە منداڵیەوە کچ وا پەروەردە دەکرێت کە تەنها بریتی بێت لە جەستە و دواتر بەدرێژایی ژیانی بەوەوە سەرقاڵ دەبێت , بێئەوەی بزانێت کە مێشکی هەیە و دەتوانێت سوودی لێوەرگرێت .
- بۆچی وا دەکەن ؟
- لەبەرئەوەی ئەو پیاوەی جڵەوی ژیانی بەدەستەوەیە جگە لەوەی دەیەوێت کە ئافرەت وەک ئاژەڵێکی بێ مێشکی جوان لەبەر پێیدا بێت , نایەوێت هیچیتر بێت .
- بۆچی ؟
- پیاو نایەوێت ئافرەت ببێتە بەرهەڵستکار یان هاوبەشی , بەڵام دەیەوێت سەر بەو بێت و خزمەتکاری بێت , پێکەنی و منیش پێکەنیم .

بینیم لێم نزیك دەبێتەوە و دەڵێت :

- من ئەو پیاوە نیم .. من دەمەوێت ئافرەت هاوبەشی ژیانم بێت نەك خزمەتکار .. من شانازی بە مێشکتەوە دەکەم .. نازانی چەندە شادومانم کاتێک دێمە نۆرینگەکەت و ئەو هەموو ئافرەت و پیاوە دەبینم چاوەڕێن شتێکیان لە تەندروستی و چاکبونەوە پێ ببەخشیت . پەرۆشی ئەزموون و ئامۆژگاریەکانتم .. ئایا دەکرێت ئافرەتێک مێشکێکی وەك تۆی هەبێت ؟ بەند بکرێت لە ماڵەوە تا خواردن دروست بکات ؟

ئایا دەشێت ئافرەتێک کە ئەو زانست و ژیریەی تۆی هەبێت ژیان لەپاڵ شیردان و پەروەردە کردنی منداڵدا بەسەر بەرێت وەك سەگ و پشیلە ؟

نەخێر .. مەحاڵە ؟ ئەمە ناپاکیە بەرامبەر بە تۆ و سەرجەم مرۆڤایەتی .

وشەکانی بەناخی هەڵچوومدا چووە خوارەوە و هێمنی کردەوە , چووە دڵمەوە و ئارامی پێبەخشی .. وا هەستمکرد کە ئەو ململانێیەی لەنێوان من و پیاودا هەیە تا دوا دڵۆپ دەتوێتەوە .. سەری کاسم خستەسەر بەردەکانی هەڕەم و هەناسەیەکم هەڵمژی بۆچی دایکم لەم قسانەی نەدەکرد ؟ بۆچی کۆمەڵگە دان بەم واتایەدا نانێت ؟

ئەوەتا ئەوە پیاوێکە دانی پیادا دەنێت .. ئەوەتا ئەوە پیاوە دان بەبیر و مێشکی ئافرەتدا دەنێت .. ئەوە پیاوە دان بەوەدا دەنێت کە ئافرەت لە پیاو کەمتر نیە و جەستە و مێشکی هەیە .. ئەوە پیاوێکە ئەو وتانە دەڵێت کە لەوکاتەی چاوم هەڵهێناوە ناخم دەیچڕێت ..

سەرنجیمدا تا بزانم .. ئەم وشەیە تەواو و پڕ واتایانە لە کوێوە هەڵدەقوڵێت؟

لە ناخیەوە یان لە قوڕگیەوە ؟ نەمتوانی هیچ بڵێم و هیچ ببینم.. ماوەی نێوان ناخی و قوڕگی دیاری نەبوو .. لەوانەیە ناخیم نەبینیبێت .. یان لەوانەیە خۆر کەوتبێتە ئەو کەندەڵانە قوڵەی کە هەموو شەوێك تێی دەکەوێت و تێی دەچێت بەو هۆیەوە نەخشەی شتەکانم لێ وون بوبێت .. هەستم بە دەستە ساردەکانی کردوو سەرنجی ڕوخساریمدا .. زەردەخەنە بێدەنگەکەی دایکایەتی دەوروژاندم .. بەڵام تێڕوانینە لاوازە ڕاستەقینەکانی سوپاسگوزاری مێینەییمە .. بۆچی ؟

ئایا لەبەرئەوەی لاوازە .. لەمن لاوازترە ؟ یان لەبەرئەوەیە وەك من واتای ئازاری نەزانیووە ؟ یان لەبەرئەوەیە کە چاوەکانی ئەو هێز و توانا قوڵەی لەدەستداوە کە من لە پیاودا دەمەوێت ! یان هێشتا لە خوێنمدا مێینەیی ئافرەتی جەنگەڵستان هاتوچۆیەتی کە تینوی سەرکەوتنی پیاوە بەسەریدا ؟! بەڵام ئەو شتێکم تیادا قایل دەکات .. لەوانەیە لاوازی ئەو توانای من دەربخات .. لەوانەیە ئەو تێڕوانینە ویستراوەی ئەو بیرەم تێر بکات کە سوورە لەسەر سەرکەوتن .

* * *

بە زەردەخەنەیەکەوە پێی وتم :

- دایکیشم هەمان ئەم تێڕوانینە بەهێزەی هەبوو .. بەڵام ئەو چاوەکانی سەوز بوون .

وشەی دایك لەژێر سمێڵەکانیەوە وا هاتە دەرەوە شیوازی ڕوخساری گۆڕی بۆ منداڵێکی بچووك .

- گوێم لێبوو وتی بۆچی بەو شێوەیە سەیرم دەکەیت ؟
- پێموت : دایکت خۆشدەویست ؟

چاوەکانی پڕبوو لە فرمێسك و پاشان وتی : زۆر .

فرمێسکەکانی نەیوروژاندم .. وتی : دوای مردنی وا هەستمکرد دونیا بەتاڵ بووە .

پاشان بێدەنگ بوو و وتی : بەڵام تۆم دۆزیەوە .. ئیدی وا هەستمکرد سەرلەنوێ دونیا پڕبووە .

- شتێکی سەیرە !
- چی سەیرە ؟
- کە دونیا بەتاڵ بێت لەپێشچاوت دوای مردنی کەسێک .
- ئەو دایکم بوو .. خۆشەویستیەکی زۆرم هەبوو بۆی .. ئەو هەموو شتێکی لەپێناو مندا دەکرد .. ئەی تۆ ؟ دایکت خۆشدەویست ؟
- خۆشمدەویست .. بەڵام هەرگیز ژیانی پڕ نەکردبووم .
- لەوانەیە باوکت زیاتر خۆشویستبێت ؟
- ئەویشم وەك دایکم خۆشدەویست .
- ئەی ئەوەی ژیانی پڕ کردویت کێیە ؟
- کەس نەبووە .
- ئەی چی بووە ؟

- نازانم لەوانەیە هەرگیز پڕ نەبێت .. یان لەوانەیە من بەدوای هێنانەدی هەوڵمدابێت .
- ئەو شتە چیە ؟
- نازانم .. لەوانەیە بەنیازبم کارێکی گەورە ئەنجام بدەم .
- چارەسەری نەخۆشەکان ؟
- لەوانەیە لەوە گەورەتر بێت ..

* * *

- حەز دەکەیت بۆ هەتایی لەگەڵ مندا ژیان بەسەر بەریت ؟
لێی پرسیم و بە تێڕوانینێکی منداڵانەی هەتیوانە سەرنجی دەدام .. دایکایەتی و مرۆڤایەتی وروژاندم و هەستمکرد حەز دەکەم ئەو داواکارییەی بۆ بێنمەدی .. هەستمکرد شتێک ڕامدەکێشێت بەسۆزێکەوە سەرنجیمدا ..
بۆ جاری دووەم لێی پرسیم : حەز دەکەیت شووم پێ بکەیت؟
وشەی شوو و هاوسەرگیری دای بە مێشکمدا و هەموو بیر و بۆچونەکانمی بەرە و دواوە برد .. کاتێک منداڵبووم , ووشەی شوکردن چی دەگەیاند لام ؟
پیاوێک ورگێکی گەورەی هەیە و تیایدا مێزێکی خواردن هەیە .. لە مێشکمدا بۆنی چێشتخانەی ماڵەوەم بە بۆنی مێرد دانابوو .. قینم لە ناوی مێرد بوو .. قینیشم لە بۆن و بەرامەی خواردن بوو ..
بێئەوەی هەست بکەم لێم پرسی : حەزت لە خواردنە ؟
بە سەرسوڕمانێکەوە وتی : خواردن ؟
- بەڵێ .
- ئەم پرسیارە سەیرە لە ئێستادا چیە ؟
- پیاو لەبەر ئەوە ژن دەهێنێت تا نان بخوات .
- کێ ئەمەی وا تێگەیاندویت ؟
- هەموو خەڵکی .

- ئەمە هەڵەیە .
- بۆ کاتێک دایکت مابوو بیرت لە ژن هێنان نەکردبۆوە ؟
- دایکم تەنها خواردنی بۆ دروست نەدەکردم .. ئەو هەرچیم بویستایە پێیدەدام .
- تۆ لەبەر ئەوە ژن دەهێنیت تا کەسێک هەبێت هەرچیت بویت پێتی بدات ؟

وتی : نەخێر .. وەك ئەوەی بڵێ : بەڵێ .

پیاوێکی بەتەمەن لەسەر سەری پارچەیەك قوماشی سپی ( عەمامە ) ی بەستووە بەڕێزێکی تایبەتیەوە لێی دەروانرێت و گوێ لە وتەکانی دەگیرێت .. من نابینێت و گوێم بۆ ناگرێت وەك ئەوەی لەپێشچاوی نەبم .. قەڵەمێکی بەدەستەوەیە لەگەڵ دەفتەرێکی تۆماری گەورە .

- قوربان پێشەکی چەندە و پاشینەی چەندە ؟

ئەم ووشە ناخۆش و سەیرانە چیە لە لێوە وشکهەڵاتوەکانیەوە دەبیسترێت ؟

پێشەکی ؟ پاشەکی ؟! ئایا ئەو پارەم بۆ دەدات تا شوو بکەم ؟ ئەو کە هیچی نیە تا پێم ببەخشێت !

بەڵام کابرای عەمامە بەسەر نازانێت کە کاممان هەمانە و کاممان نیمانە .. ئەو تەنها پیاوەکە دەبینێت .. من وەك ئافرەتێک دەبینێت .. لەچاوی ئەودا تەنها پیاو خاوەنی بوونە و هەیەتی .. بە لووت بەرزیەکەوە لە شێخم ڕوانی و پێموت : بنوسە هیچ ! کابرا بەسەرسوڕمانێکەوە سەرنجیدام .. وتی : چۆن دەبێت ئافرەت لەبەرچاوی پیاودا قسە بکات !

پاشان بە زمانی مەلایانە وتی : بەمجۆرە ئەم پەیمان بەستنە بەتاڵە .

- لێم پرسی : بۆچی ؟
- وتی : شەرع وا دەڵێت .
- وتم تۆ شەرع ناناسیت .

کابرا لەسەر کورسیەکە ڕاپەری و خەریکبوو ( عەمامە ) کەی سەری بکەوێتە خوارەوە .. بە دەستی گرتی و هاواریکرد : استغفر الله .. استغفر الله !

* * *

شێخی عەمامە بەسەر بە زمانی پەنجەکانی تەڕکردوو قەڵەمی لە مەرەکەب هەڵکێشا و ( بسم الله ) ی کردوو ( قل هو الله ) ی کردوو دەستیکرد بە نوسینی پەیمان نامەی شوکردنم وە دەستێکی بۆ درێژکردم و بە دەستەکەی تری وتی : ئێرە واژۆ بکە .
بە ئینکاری وتم : جارێ , ڕێگەم بدە هەمووی بخوێنمەوە .
بە حەسرەتێکەوە سەیری کردم و ڕێگەیدام بیخوێنمەوە .. چاوم کەوتە سەر ووشەی سەیر سەیر لەو ووشانەی دەکرد کە لە بەڵێننامەی بەکرێدانی خانوو و دوکاندا بەکار دێت ..
لە فڵانە ڕۆژدا بە ئامادە بونمان و لەسەر دەستی مندا فڵان .. مەلاو ڕێگە پێدراوی فڵان جێگەم .. سەر بە دادگای فڵان .. بۆ باری کەسێتی .. فڵان کەس هەستام بە مارە بڕینی .. فڵانی کچی فڵان .. وە ڕێککەوتن لەسەر هێندە .. هێندەی حازر و .. هێندەی قەرز .. چوونە ژیانێکی هاوسەری شەرعی لەسەر کتێبی خوداوەندوو سوننەتی پێغەمبەر ( د . خ ) بڕیاردرا بە بە یەکگەیشتنی شەرعی هەردوو هاوسەر و لێك گەیشتنیان و سۆراخکردنی ئەوەی کە ئافرەتەکە هیچ مووچە و یارمەتیەکی حکومی شك نابات و بە شاهیدی هەریەك لە فڵان و فیسار ..
بە هەردوو دەستم وەرەقەکەم گرت تا بیدڕێنم بەڵام شێخ لێی وەرگرتم و لە چاوەکانیدا نیگەرانی و لاوازیم هەست پێکردوو بەبێدەنگی پێی وتم :
ئەوە کارێکی ئاسایی و ڕۆتینە و هیچیتر ..
پاشان واژۆم کرد ..

*            *            *

وەك ئەوە وابوو واژۆم لەسەر بەڵگەی مردنم کردبێت .. ئەو ناوەی ئاشنایەتی لەگەڵ مێشک و ناخمدا پەیدا کردبوو ئێستا ڕەتکراوەتەوە .. ناوی خرایە سەر لیستەکەی من .. لە تەنیشتی دانیشتم ..

گوێم لێبوو خەڵکی بە ناوێکی نوێوە بانگیان دەکردم , منیش بە سەرسوڕمانێکەوە لەخۆم و ئەوانم دەڕوانی وەك ئەوەی لەگەڵ منیان نەبێت .. وەك ئەوی مردبێتم .. ڕۆحی ئافرەتێکی ترم تێهاتبێت لە من دەکات و ناوێکی سەیری هەڵگرتووە ..

جیهانە تایبەتەکەم .. ژووری نوستنەکەم .. ئێستا تەنها تایبەت نیە بەخۆم .. جێگەکەم .. کە هیچ کەسێک هاوبەشی لەگەڵدا نەدەکردم .. ئێستا ئەو لەگەڵمدا هاوبەشە .. هەر جارێك کە هەڵدەگەڕێمەوە یان بجوڵێمەوە دەستم بەر سەرە زبرەکەی یان قۆڵی یان قاچە لینج و زبرەکەی دەکەوێت .. دەنگی هەناسەکانی تەواوی دەوروبەری پڕکردووم لە نرکە ..

هیچ شتێک نامبەستێتەوە بەم پیاوەوە کە چاوەکانی نوقاوە ..

هیچ شتێکی تیادا نابینم جگە لەوەی کە وەك لاشەیەکی کەوتوو وایە لەوانەی کە لە ( هۆڵی توێکاری ) بینیومن .. بەڵام گەر چاوەکانی هەڵهێنا و بەو سەرنجە پڕ لاوازی و منداڵانەیە لێی ڕوانیم دایکایەتیم تیادا دەوروژێنێت و مێینەییم دادەمرکێنێتەوە و هەست دەکەم منداڵێکی بچکۆلانەیە لە قوڵایی ناخمەوە بوومە لە جێگەیەك و زەمەنێك هیچ شتێکیان لەبارەوە نازانم .

*            *            *

- من پیاوم .
- واتای تۆ پیاویت چیە ؟
- کە من خاوەن دەسەڵاتم .

- کام دەسەڵات ؟
- دەسەڵاتی ئەم ماڵە بە هەموو شتەکانیەوە بە تۆشەوە .
سەرەتاکانی یاخیبوون سەریهەڵدا .. هەستکردنی بە لاوازی لە بەرامبەرمدا لە ناخیدا هەڵگەڕایەوە و بووە حەزی دەستگرتن بەسەرمدا ..
- نامەوێت هەموو ڕۆژێک بچیتە دەرەوە .
- من بەخۆڕایی ناچمە دەرەوە .. من کاردەکەم .
- نامەوێت جەستەی پیاوان ڕووت بکەیتەوە و بیانپشکنیت .
خاڵی لاوازی پیاو کە پشتی پێ دەبەستێت بۆ دەستگرتن بەسەر ئافرەتدا .. پارێزگاری کردنیەتی لە پیاو .. غیرەی نێرینە لە مێینەکەی .. وای نیشان دەدات کە لەو دەترسێت بەڵام لە ڕاستیدا لەخۆی دەترسێت ..
پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات کە پارێزگاری لێ دەکات تا دەستی بەسەردا بگریت و لەنێوان چوار دیواردا بەندی بکات .
- ئێمە پێویستمان بە داهاتی ( نۆڕینگە ) نیە .
- من لەپێناو پارەدا کار ناکەم .. من کارەکەمم خۆشدەوێت ..
- پێویستە بەتاڵ بێت بۆ ماڵ و مێردت .
- مەبەستت چیە ؟
- نۆڕینگە دابخە .
ئەو وایدەزانی کە کارەکەم توانای ئەوەم پێدەدات کە ناتوانێت دەستم بەسەردا بگرێت ..
وایدەزانی ئەو چەند مشتە پارەیەی مانگانە دەستمدەکەوێت ئەوە وام لێدەکات بەسەر ئەودا خۆم بە زل بزانم و زاڵ ببم .. ئەو نەیدەزانی کە توانام لە ئەنجامی کارەکەم نیە .. زاڵبوون و سەربەرزیم بەهۆی ئەو بڕە پارەیەوە نیە بەڵکو من وەك ئەو چۆن پێویستی زۆری بە منە من لەبەرامبەردا وانیم و گوێی پێ نادەم .. من پێویستم نە بە دایك , نە بە باوك , نە بە برا نەبووە .. چونکە من سەر بە کەس نیم

.. بەڵام ئەو سەر بە دایکی بووە پاشان هاتووە بۆلای من .. بەڵام ئەو وەك پیاو خۆی دەبینێت .. لێکچویی پیاوی تێدایە .. دەنگی گڕە .. سمێڵ چڕە .. پیاوانی تر ڕێزی تایبەتی پیاوانەی بۆ دادەنێن .. ئافرەتانیش سەرنجی سمێڵی دەدەن .. منداڵانیش لەسەر کوچە و کۆڵانەکان ناتوانن توانجی تێگرن و وتەی ناشرین و بریندارکەری پێ بڵێن و بەردی تێگرن .

* * *

- نۆڕینگەکەت دابخە .

ئەی نەخۆشەکان ؟ ئەی ئەو تاریکیەی بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێت ؟

- پزیشکی تری جگە لەتۆ هەیە .
- ئەی پاشە ڕۆژم لە بواری تەندروستی و پزیشکایەتیدا؟ ئەی کارەکەم کە نیوەی ژیانم لە پێناویدا دانا ؟
- من ژیانتم .
- ئەی ئەو قسانەی پێت وتم و بۆت کردم ؟
- نەمدەزانی ئاوا دەبێت !

چاوەکانم هەڵبڕی سەرنجێکمدا .. چاوەکانی گێژ و زەرد .. دەستیشی پتەو و زبر , زبرتر لەوەی چاوەڕوانم دەکرد .. پەنجەکانی کورت و کوێر , کورتتر لەوەی بۆی دەچووم .. ئەم پیاوە بێگانەیە کێیە لە نزیکم ؟

ئەم تۆپەڵە مرۆڤە چیە کە ناوی مێردمە ؟

لێم نزیك بوەوە و دەستی گرتم .. بەگوێمدا چرپاندی .. ڕوخساری لە ڕوخسارم نزیك کردەوە .. هەوڵمدا خۆمی لێ گێل بکەم .. هەوڵمدا وتەکانی لەبیر بکەم .. ویستم چاوەکانم و گوێیەکانم بەدرۆ بخەمەوە .. ویستم .. ویستم .. بەڵام ئەفسوس .. بیرم زۆر بەئاگایە و هەر وشەیەکیم لەبیرە .. مێشکم بە ئاگایە .. بە ئاگا .. ڕاپێچم دەکات بەرە و ناخی ڕاستی شاراوەیی .. چاوەکانم کراوەن ددانەکان

و گوێکانی دەبینیت .. گوێیەکانی گەورە و لۆچ بوون وەك گوێی کەروێشك .. لێی دورکەوتمەوە .. بەڵام بە دەستەکانی گرتمی و ڕایکێشام بۆلای خۆیی و بە گوێمدا بە دەنگێکی ناسازی ناخۆش چرپاندی بە بێزارییەکەوە لە خۆمم دورخستەوە و پێموت :

- بۆچی درۆت لەگەڵ کردم ؟
- من دەمویست ببێتە هی من .
- مەحاڵە ! من پارچە زەوی نیم .
- ئەو بڕیارە بە دەست منە ! من مێردتم !

ئەو تێڕوانینە لاوازەی هەیبوو نەما ئەو ڕایەڵەی من و ئەوی پێکەوە گرێدا پسا .. لە قوڵایی چاوە گێژەکانیەوە تێڕوانینێکی ڕقاوی سەریهەڵدا .. کە سەرنجی پیاوێکی بەتوانا نەبوو .. بەڵکو سەرنجی پیاوێکی لاواز بوو کە هەستی بە کەلێنی ناتەواوی دەکرد .. گۆشەگیری ئەو پیاوەی خۆی بە بەهێزترین لایەن دەزانێت لە نێوان خەڵکی لە شەقامەکاندا پاشان هەست دەکات کە بێدەسەلاتترین و لاوازترینە لەنێوان دیوار و ماڵەکەیدا .

* * *

لە نۆرینگەکەم دانیشتم سەرم شۆڕ کردەوە دانم بەو هەڵەیەدا نا کە کردبووم .. بەڵێ هەڵەم کرد .. بڕوام بە قسەی ئەو پیاوە کرد لە تاریکیدا بێئەوەی قوڵایی ببینم .. سەرنج و تێڕوانینی لاواز لە خشتەی بردم من هەرگیز نەمدەزانی کە مرۆڤی لاواز و بێدەسەلات لەژێر پێستیەوە کۆمەڵێك لە قین و گۆشەگیری حەشارداوە .. بەڵێ هەڵەم کرد لە ئامۆژگاری مێشک و دڵم دەرچووم و پشتگیری پیاوم کردوو پەیماننامەی شوکردنم واژۆ کرد کە لە پەیماننامە و بەڵێننامەی بەکرێدان و فرۆشتنی دوکان و خانوو دەکات ..
ئایا بەپێی ئەو پەیماننامە سەیرە نەمکرد بە خاوەن دەسەلات بەسەر خۆمدا ؟

ئایا هەر ئەو بەڵێننامەیە نەیکردە مێردم ؟
ئەو ووشەیەی هەرگیز بە دەممدا نەهاتووە ! مێردم ! ووشەی مێردم لای من چی دەگەیەنێت ؟ ئەو لاشە ئەستورەی نیوەی جێگەکە داگیر دەکات .. ئەم دەمە فراوانە کە هەر دەخوات و دەخوات ئەو دوو قاچە پانەی گۆرەوی و جێگە پیس دەکات .. ئەو لووتە زبرەی بە درێژایی شەو بە پرخە و فیکە بێزاری کردووم .. بەڵام ئێستا چی بکەم ؟ دەبێ باجی ئەو هەڵەیەم بدەم و بۆ هەتایی لەگەڵی بژیم .
بەڵام چۆن لەگەڵیدا بژیم ؟ چۆن لەگەڵی بدوێم ؟ چۆن سەرنجی چاوەکانی بدەم ؟ چۆن لێوەکانمی بۆ سەربەست بکەم ؟ چۆن ڕۆح و جەستەمی بدەمێ ؟ نەخێر .. نەخێر ئەو هەڵەیەی تێی کەوتووم ئەم هەموو سزایەی ناوێت .. هەڵناگرێت !
هەموو کەسێک هەڵە دەکات ژیان لەسەر هەڵە و ڕاستی بنیاتنراوە .. بەڵکو ئێمە هەست بە ڕاستیەکان ناکەین تا نەکەوینە هەڵەوە .. هەڵە واتای سستی و گێلی ناگەیەنێت بەڵکو بەردەوام بوون لە هەڵەدا ئەوە لاوازی گێلیە ..

* * *

خەڵکی بە نارەزایی و سەرسوڕمانەوە دەم هەڵدێننەوە ..
- چۆن مێردەکەی جێهێشت ؟ بۆچی ؟
چەند بە جەرگن , چاو نەترسن ئەو خەڵکە کە ڕۆح و جەستەیانم پێ دەدەن تا فریای بکەوم و بەدووری بگرم لە مردن .. چۆن دەتوانن ڕەخنە لە شتێک بگرن کە تایبەت بێت بەخۆم ؟
بەڵکو چۆن دەتوانن تەنانەت ئەو وتەیە بدەن بە گوێمدا ؟ من پێیان دەڵێم چی بخۆن و چی بخۆنەوە ؟ بۆیان شیدەکەمەوە چۆن هەناسە بدەن و چۆن بنوون و بژین و چۆن زۆر ببن ..

دەبێت بیریان چوبێتەوە ؟ یان وا هەست دەکەن کاتێک بەرگی سپی پزیشکیم دانا و جلوبەرگی ئاساییم پۆشی ئیتر لەگەڵیدا مێشکم دادەنێم و ژیریم بیردەچێتەوە ؟

چەند نەزانن ! دایکم منداڵیمی لەناوبرد .. زانستیش سەرەتای دەستپێك و لاوێتیمی لووشدا .. لاوێتیم تەنها چەند ساڵێکی کەمی ماوە کە بە پەنجە دەژمێردرێت .. هەرگیز بە هەدەری نادەم ! وە ناهێڵم کەسیش بە هەدەری بدات .

مەملەکەتە بچکۆلانەکەم کە بە کورسی و بووکە شووشە دەمڕازاندەوە کاتێک منداڵ بووم ئێستا بۆتە ڕاستی .. لە گیرفانمدا کلیلە سیحریەکەیم هەڵگرتووە .. دەچمە ناوی و دێمە دەرەوە هەرکات ویستم و بێ پرسی کەس .. لەناو جێگەکەمدا بە تەنیا بێ مێرد دەنووم .. بە ئارەزووی خۆم تل دەدەم هەڵدەگەڕێمەوە لە ڕاستەوە بۆ چەپ و بە پێچەوانەشەوە .. لە کتێبخانەکەمدا بۆ خوێندنەوە یا نوسین دادەنیشم .. یان داڵغە لێدان و بیرکردنەوە .. یان هیچ شتێک ئەنجام نادەم .. من سەربەستم .. لە مەملەکەتە بچکۆلانەکەمدا تەواو سەربەستم .. دەرگا لەسەرخۆم دادەخەم و پێڵاو و جلوبەرگ و ژیانی ساختەم لەگەڵ خەڵکیدا دادەکەنم و بە ئازادی لە ماڵەکەمدا دەسوڕێمەوە .. من تەنیام .. تەواو تەنیام .. لە ماڵکەمدا هیچ گوێم نە لە دەنگ و هەناسە نیە .. هیچ ڕوخسار و جەستەیەکیش نابینم ..

بۆ یەکەمجارە لە ژیانمدا هەست بە لاچوونی کۆڵێکی گەورە دەکەم لەسەر دڵم .. گرێی هاوبەشیکردن لەگەڵ کەسێکدا لە ماڵەکەمدا .

* * *

لە نیوەی شەودا پێڵوی چاوەکانم هەڵبڕی بە ئاگا هاتم لە تەپەی دڵم کە خەریکبوو لە سنگم دەهاتەدەر .. هەناسەکانم بە تەنگی و ساردی دەهاتنەدەر . چاوەکانم کراوەن و جگە لە تاریکی هیچیتر نابینن ..

بێدەنگی و خامۆشیەکی ئێجگار ترسناك دێتە گوێم .. هەستم بە ترس کرد .. وەك ئەوەی دڵم لە لێدان بکەوێت .. هەناسەم بخنکێت .. تاریکی ڕۆشنایی چاوەکانم بکوژێنێتەوە .. گوێکانم لە دەست بدەم .. سەرنجی تاریکیەکەم دەدا وەك ئەوەی چاوەکانم تاقیبکەمەوە .. گوێم هەڵخست وەك ئەوەی گوێ و بیستنم تاقیبکەمەوە .. بینیم تۆپەڵێك بە تاریکایی دەبێتە پارچەی وردتر و بچوکتر .. سەر و کلك و گوێی هەیە .

دەنگی سەیر و هێمنی دەهاتە ئەو پانتاییە چۆڵەوانیەوە .. هەندێکیان دەیانچرپاند .. هەندێکی تر هێمنتر .. جۆرێکی تر وەك شێوە لوراندنێك .

سەرم کرد بەژێر بەتانیەکەدا بەهیوای چاو و گوێ داخستن .. ئیتر هەرچی خێو و دەنگێک کە هەبوو ڕەویەوە و نەما .. ناو سنگم ئارام بوەوە .. گەرمی ناو جێگەکە بە سەرتاپا جەستەمدا هات و قۆڵەکانم ڕاکێشا و خۆمدایە دەست خەو .. بەڵام خەو لەوێ نەبوو .. پاشان دەستمکردە ملی شتێکی تر دوو چاوی هەیە وەك چاوەکانی باوکم بەڵام باوکم نیە .. دوو لێوی هەیە لە لێوی کوڕی مامەکەمی دەکرد بەڵام ئەو نەبوو .. دەبێت کێبێت ؟ کێ ؟

دیسان ئەو شەبەنگەی کاتی هەرزەییم شەوانی درێژ و بێخەو دەمکرد سەردانی کردم .. شەو درێژبوو .. جێگەکەش گەورە و فراوان بوو .. چیتر تەنیایی دڵگیر و سیحراوی نەما ..

*     *     *

لە کوێ بیدۆزمەوە ؟

چۆن لەم جیهانە بەرین و قەرەباڵخەدا بیدۆزمەوە ؟ ئەم شەبەنگەی ناخم دەیناسیت ئەی ئاشنایەتی .. ئەم پیاوەی لە خەیاڵمدا دەژی .. تێڕوانینی چاوەکانی دەناسم .. لەرینەوەی دەنگیشی دەناسمەوە ..

شێوە و شێوازی پەنجەکانیشی دەناسمەوە .. هەروەك گەرمی هەناسەکانیشی دەناسمەوە .. ناخ و مێشک و دڵی دەناسمەوە . دەیناسمەوە .. دەیناسمەوە .. چۆن دەزانم ؟ نازانم ؟ بەڵام دەزانم ؟ ئایا ڕۆژێک پێی شاد دەبم یان بۆ هەتایی لە چاوەڕوانیدا دەبم؟
ئەی ئەم زەبەلاحەی لە ناخمدا ڕاکشاوە چی لێبکەم ؟ ئایا دەشێت بەو شێوەیە بە گۆشەگیری و خەفەکراوی بۆ هەتایی بیهێڵمەوە ؟ یان هەوڵبدەم دڵی ڕابگرم ؟ بەڵام چۆن ڕایبگرم لە کاتێکدا ئەو ویستی بە تەنیایی مانەوەیە بەو مەرجەی بە دڵنەواییەکی ساختە و ناتەواو ڕابگیرێت ..
بەڵێ .. پیاوێکی تەواوم دەوێت وەك لە داڵغەمدایە .. خۆشەویستیەکی تەواوم دەوێت وەك لە ناخمدا و لە هیچ شتێکیش نابورم هەرچەند تەنیایی و بێبەشی لام درێژە بکێشێت .. هەموو سەرجەم یان هیچ شتێک .. ئەمە بۆچونی منە .. هەرگیز بە نیوەیی شتەکان قایل نابم ..
بڕیارمدا بە دوایدا هەموو جێگەیەك بگەڕێم .. لە کۆشکەکاندا لە ئەشکەوتەکاندا .. لە یانە و دەوروبەرەکاندا .. لە کارگەی زانست و پەرستگای هونەر .. لە ڕووناکی و تیشکە بەهێزەکاندا .. لە تاریکاییدا .. لە لوتکە بەرزەکاندا و لە چاڵە قووڵ و خامۆشەکاندا .. لە شارە ئاوەدانەکاندا و لە دارستانە چۆڵ و ترسناکەکاندا ..
بۆچی خەڵکی بە سەرسوڕمانەوە لێم وورد دەبنەوە ؟ چی سەری ئەو خەڵکە دەسورمێنێت ؟
ئەوەیان بەس نیە کە چەند لە تەمەنم ڕۆیشتووە ؟ ئەوان چییان دەوێت ؟
دەیانەوێت دەستم بخەمە ژێر چەناگەم و لەماڵەوە دانیشم تا پیاوێک لە شەقامەکانەوە بێت و بمکڕێت وەك چۆن مانگایەك دەکڕێت ؟
ئایا لە ژیاندا مافی ئەوەم نیە خۆم ئەو پیاوەی دەمەوێت دەستنیشانی بکەم؟

باشە چۆن هەڵیبژێرم ؟
لە نێوان ئافرەتاندا یان لە نێوان وێنەکاندا یان منیش هەمان پیاو دەستنیشان بکەم کە من دیاری دەکات ؟
ئایا پێویست و گرنگ نیە لەنێوانی پیاواندا بەدوایدا بگەڕێم ؟ ئەی چۆن بیدۆزمەوە گەر لێرە بۆ ئەوێ نەچم و سەرنجی ڕوخسار و چاوی ئەو پیاوە نەدەم ؟ .. گوێبیستی دەنگیان و هەناسەیان ببم و دەست لە پەنجە و سمێڵەکانیان بدەم .. ناخ و دڵ و مێشکیان بخوێنمەوە ؟ ئایا دەتوانم ئەو پیاوە لە تاریکاییدا یان لە دووری کیلۆمەترێک بدۆزمەوە ؟
ئایا پێویست ناکات لە ڕووناکیدا ببینم ؟ تاقیبکەمەوە و بیناسم؟ ئایا گرنگ نیە ئەزموون و تاقیکردنەوە پێش ناسین بکەوێت ؟ یان ئەوان دەیانەویت بۆ جاری دووەم بکەومەوە هەڵە ؟
ناچاربووم دەبوایە ئەو تاقیکردنەوەیەم ئەنجامبدایە .. ترسناکترین تاقیکردنەوە لە ژیانی ئافرەتدا .. تاقیکردنەوەی هەڵبژاردنی پیاو .. تاقیکردنەوەی گەڕان بەدوای خۆشەویستیدا..

*    *    *

تەنها چاوەکانیم دەبینی .. بەردەوام شیوازی ڕوخساری بە شاراوەیی لەژێر دەمامکە سپیەکەوە بوو .. پەنجەکانی دەستیشی لەناو دەستکێشە چەرمە دێتۆل کراوەکەدا بوو .. شێوەی جەستە و ئەندامەکانی لەشیشی لەژێر چاکەتی نەشتەرگەرییە فراوانەکەدا بوو .. قاچەکانیشی لەناو جوتێک پێڵاوی گەورەی قوڵدا بوو .. هەناسەکانیشی تێکەڵ بە هەوای ئامێری سڕکەرەکەی ناو ژوورەکە دەبوو لەگەڵ بۆنی ( ئەسیر ) دا دەبونە یەك ..
بینیم بە لا چاوێک سەرنجمدەدات .. لە ژووری نەشتەرگەرییەکەشدا کەسمان لا نەبوو جگە لە پیاوێکی

لەهۆشخۆچووی ڕاکشاو لەسەر مێزی نەشتەرگەری چاوەکانی لێکناوە و ناو سکی لەو تلێشە گەورەیەی کراوەتە ورگی دیارە.
بۆچی وا بە لا چاو سەرنجمدەدات ؟ لە کێ دەترسێت ؟ لەو پیاوە لەهۆشخۆچووە یان لە من یا لەخۆی ؟ یان وا ڕاهاتووە کە بترسێت و ئاوا بە لاچاو سەرنج بدات ؟
گوێم لێبوو وتی : دالغەت بۆ کوێ چووە ؟ بیر لەچی دەکەیتەوە ؟

- لەو پیاوە .
- لە کام پیاوە ؟
- ئەم پیاوەی ورگیمان کردۆتەوە .

پێکەنی .. بەڵام نە ددانەکانی نە لێوەکانیم نەبینی بەهۆی دەمامکە سپییەکەوە , بەڵام گوێم لە پێکەنینەکەی بوو . پێکەنینێکی کورتی گاڵتەجاڕانە .. بێدەنگ بوو .. ئەنجا دەستی بە گەڕان کرد بەدوای ڕیخۆڵەی ناو ورگی کابرا کە بەهۆیەوە نەخۆش بوو .. پاش چەند چرکەیەك و دوای ئەوەی بە گیرە پزیشکیەکە ڕیخۆڵەکەی دۆزیەوە و وتی :

- پاککردنەوە و لابردنی هیچ سوودی نیە .. شێرپەنجەکە لەناوی بردووە ..

سەرنجێکی ڕوخساری کابرای نوستومدا هەستم بە چەقۆیەکی تیژ کرد سنگم هەڵدەدڕێت سەرم داخست تا بەبێدەنگی فرمێسکەکانم بشارمەوە ..
گوێم لێبوو پێکەنی و وتی : چیە دەڵێی تا ئێستا لەگەڵ ئەم ئازارانە ڕانەهاتویت ؟

- من هەرگیز لەگەڵ ئەم ئازارانەدا ڕانایەم .

سەیرێکی کردم و بێدەنگ بوو .. دەستمانکرد بە دورینەوە و داخستنی ورگی نەخۆشەکە بەبێدەنگی .. لەپڕ گوێم لێبوو وتی:

- دەزانیت بیر لەچی دەکەمەوە ؟
- نەخێر .

- بیر لەتۆ دەکەمەوە .

بە بڕوابونێک بەخۆی ئەم ووشانەی درکاندوو چاوی تێبڕیم منیش بە قووڵی سەرنجیمدا ..

*        *        *

تێڕوانینێکی قووڵ سەرنجیدام و هەوڵیدا هەموو واتاکانی حەزی بۆ ئافرەت بەلاوە بنێت .. وتی : ئافرەت دوای ئەوەی شویکرد سەربەستر دەبێت وەك لە کچێک .

بە توڕەییەکەوە سەیرمکردوو وتم :

من سەربەستی و ئازادیم لە خانە سست و لاوازەکانی جەستەمەوە وەرناگرم .. بەرهەڵستیشم لە ترسی لەدەستدانی کچێتی نیە لە ئەنجامی پیاکێشانێکی سەرشێتانەی بە ئازار .. من هەرکات بمەوێت ناڕازی دەبم و ڕەتکردنەوە دەدەم .. سەربەستی و ئازادیشم هێندەی تێی گەیشتبم بە ویستی خۆم پیادە دەکەم .

بە تێڕوانینێکی ناڕازییانە سەرنجیدام و وتی :

- ئەی کە وایە بۆچی دەترسیت ؟
- لە چ شتێک ؟
- لە من .
- لەتۆ ؟!

چی لە من دەوێت ؟ یان من چیم لەو دەوێت ؟ نازانم .. بەڵام دەمەوێت شتێک بزانم .. سەبارەت بە پیاوان .. یان سەبارەت بەخۆم .. شتێک کە تا ئێستا نادیارە ..

*        *        *

بەپێی خۆم چوومە بەردەرگای ماڵەکەی .. بە دڵنیاییەوە لە زەنگمدا . زەردەخەنەیەکی فراوانی تێکەڵ بە هەستی سەرکەوتنی کێشاو وتی :

- لەو بڕوایەدا نەبووم بێیت ..

- بۆچی ؟
- وا هەستم دەکرد کە چیتر متمانەم پێ نەکەیت .
- من چیتر متمانەت پێناکەم .

دانیشتم .. هات و لە تەنیشتمەوە دانیشت و خەریکبوو قاچەکانی بەر قاچەکانم دەکەوت هەستام و لە بەردەمیدا دانیشتم ..
بە زەردەخەنەیەکی مەکراویانە وتی : بۆچی لە تەنیشتم دانانیشیت ؟
سەرنجی ڕوخساریم دەداو پێموت : حەز دەکەم بەرامبەرت دانیشم .

- بۆچی ؟
- تا چاوەکانت ببینم .

بێدەنگ بوو بە چاوم سەرنجەکانیم گرت لەو کاتەی خۆیان لە تێڕوانینەکانم دەدزییەوە .. پاش کەمێك دالْغە لێدان هەستاو چووە ژورێک لە ژوورەکان و گەڕایەوە و لەگەڵ خۆی بتڵێکی شووشەی درێژی هێناو بەتاڵیکرد , خواردیەوە , پێموت : ئەمە چیە ؟
وتی : مێشکت وەك شمشێر تیژە !
بە خێسەیەکەوە سەرنجێکی قاچەکانیدام و وتی : دەمەوێت لە دەست مێشکت ڕزگار ببم !
مێشکم تیژە وەك شمشێر ؟! دەیەوێت ڕزگاری ببێت لە مێشکم؟!
بۆچی ؟! ئایا دەبێت جەنگ بێت ؟ ئەم پیاوە چی دەوێت ؟
بینیم زەردەخەنەیەکی سەیر گرتی .. لە زەردەخەنەکانی وورد بوومەوە هەستمکرد خۆی بۆ جەنگێک ئامادە دەکات دەیەوێت ئەو براوە بێت تیایدا ..
جەنگی پیاو و ئافرەت .. ئەو جەنگە سەیرە ساختەیە ..
تیایدا ئافرەت بە تەنیا لەبەردەم پیاودا دەوەستێت .. پیاویش لەبەردەم ئافرەتدا دەوەستێت و لە پشتیەوە مەتەرێزی نەریت و یاساکان و ئایینەکان لەگەڵیدان .. هەگبەی مێژووی نەوەکان .. ڕیزبەندی پیاوان و ئافرەتان و منداڵان .. زمانی تیژییان وەك زمانی شمشێر

پێیە .. چاوەکانیان دەکەنە نیشان وەك لولەی تفەنگەکان .. دەمە گەورەکانیان وەك دەمی زریپۆش دەکەنەوە ..
پیاو لەبەردەم ئافرەتدا دەوەستێت و پشت بە جیهان دەبەستێت بە دەستی ئەو دارە جادوییەی پێیە کە ویستەکانی ژیان بەدی دەهێنێت رابردوو و ئێستا و داهاتووی هەیە .. شەرەف و کەرامەت و نیشانەی جەنگەکانی لە دژی ئافرەتدا هەڵگرتووە .. دین و دونیای هەیە .. ئەو دڵۆپە بچکۆلانەیەی هەیە کە لە ناخی ئافرەتاندا لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا گەورە و پەروەردە دەبێت .. دانی پیادا دەنێت یان نا .. ناو و حورمەتی پێ دەبەخشێت یان نا .. سزای لە سێدارەدان یان ژیانی بەسەردا دەدات .
ئافرەتیش لەبەردەم پیاودا دەوەستێت و جیهان سەربەستی و شەرەف و ناو و کەرامەت و سروشت و ویستی لێ زەوتکردووە .. دین و دونیای لێ سەندووە .. بەڵکو ئەو بەرهەمە بچکۆلانەیەش کە لە ناخیدا پەروەردە دەبێت .. بینیم دووبارە زەردەخەنە گرتی بۆچی وا پێدەکەنێت ؟ دەتوانرێت ئەمە ناوبنرێت بە جەنگ ؟ لێم نزیکبووەوە و هەناسەی گەرمی بەر ڕوخسارم کەوت لێی دورکەوتمەوە بە سنگە خشێ و بە گاگۆڵکێ بەشوێنمدا هات , دورکەوتمەوە و وەستام .. ئەمە چیە ؟ , بۆچی بەو شێوەیە پیاو لەبەردەم حەز و غەریزەیدا دەڕوخێت ؟ بۆچی هێز و قەڵەمی ئەژنۆی دەشکێت و وەك ئاژەڵ لەسەر چوار پێ دەڕوات هەر ئەوەندە کە لەگەڵ ئافرەتێکدا دەرگای لەسەر قایمکرا ؟
بەخوا پیاو بێتوانا و بێ دەسەڵاتە ! بۆچی دایکم کردبویە خوداوەند ؟ سەرنجێکمدا و پشکنەرە کارەباییەکەم خستە سەر دڵ و مێشکی ناخێکی لاواز و بەتاڵم بینی مێشکێکی بێتوانام بەدیکرد.. دڵێکی ساختە زانیم بۆچی دەیویست لەدەست مێشکم ڕزگاری ببێت .. زانیم کە ئەمە دزە و دەیەوێت لەپشت مێشکمەوە شتێکی چنگ بکەوێت ..

بە لووت بەرزی و بەزەییەکەوە لێم ڕووانی .. بەزەییم پێیدا هاتەوە و بە ناچاری و لای خۆمەوە لەو جەنگە کشامەوە لە ڕوانگەی ئەوەی کە لەگەڵ کەسێکدا نەجەنگم لەخۆم بێ دەسەڵاتتر بێت .
هەستمکرد لەو بەهێزترم .. هەرچەند کۆمەڵێکی گەورەی لە پشتە .. لەگەڵ ئەوەی کە خۆی بە پتەو و بە توانا دادەنێت بەڵام دەستکردە .. هێز و توانای من لە قوڵاییمدایە .. لە ناخمدایە .
گەر لە نێوان چوار دیواردا لەگەڵ پیاوێکدا بەند بکرێم گەر خۆم ئارەزوو نەکەم ناهێڵم دەستی لە دەستمبدات .. وە گەر بشمەوێت خۆم بدەم بە دەستەوە ئەوا هیچ پێویست بە دزە دزە و شاردنەوە ناکات و بە بەرچاوی هەمووانەوە خۆمی دەخەمە بەردەست ..
من ئیرادە و ویستم دەستیگرتووە بە سەرمدا نەك کات و شوێن و خەڵکی .. بینیم لێم نزیکبوەوە و دەستی خستە سەر دەستم هەستم بە ساردی سەهۆڵێک کرد بە ڕۆحمدا هات .
بێهودەیە کابرا دەستت لادە .. دڵم ئامۆژگاری مێشکم دەکات , مێشکیشم جەستەمی بە دەستە و هیچ بوارێک نیە بە قایلکردنی یەکێکیان بێ ڕەزامەندی ئەویتر . جانتاکەم هەڵگرت و هەستام ..
بە سەرسوڕمانێکەوە لێی پرسیم : دەڕۆیت ؟
وتم : بەڵێ .
بە سەرسوڕمانێکی زیاترەوە وتی : بۆچی ؟
چی بڵێم ؟ بۆ تێناگات ؟ دەتوانێت بڕوا بکات ؟
پیاوێک هەیە بڕوا بکات کە ئافرەت هەیە دەتوانێت بچێتە ناخیەوە و لێی تێبگات ؟ پیاوێک هەیە بڕوا بکات کە ئافرەت هەیە جەستەی داوەتە دەست دڵ و مێشکی و بە ڕێنمایی ئەوان کاری پێدەکات ؟ بڕوا دەکات کە ئافرەتێک هەبێت چەند سەرنجی بدرێت چاو نەتروکێنێت و هیچ گوێنەداتی و دەستی بەر بکەوێت و نەترسێت و تەنانەت لە نێوان چوار دیواردا بەند بکرێت لەگەڵ پیاودا گوێنەداتی و جێیبهێڵێت و بڵێت : نەخێر .. تۆ ئەو پیاوە نیت کە من دەمەوێت !

پیاوێک هەیە بڕوا بکات کە ئافرەتێک بیپشکنێت و تاقیبکاتەوە و لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت !
نەخێر .. پیاو لەسەر ئەوە ڕاهاتووە کە تەنها ئەو دەتوانێت ئافرەت تاقیبکاتەوە هەر ئەویش مافی تاقیکردنەوە و دەستنیشانکردنی هەیە .. بەڵام ئافرەت تەنها ئەوەندەی بۆ هەیە بەو پیاوە قایل ببێت کە لە لایەنیەوە دەستنیشان دەکرێت .. تەنها پیاوێک .. ئیتر بە درێژایی ژیانی پێویستە خۆی قایلبکات کە تەنها هەر ئەو بە تەنها پێشەنگە .. ئەی پزیشکی بلیمەت ئافرەتیش وەك پیاو نیە؟ ئایا زانستت بیرچوەوە یان مێشکت جیاوازە لە جەستەت؟ بەڵام غرور پیاو دەکات بە بونەوەرێکی گێل ..

* * *

کۆمەڵگە بە تێڕوانینی تیژی وەك خەنجەر تیربارانت دەکەن .. بەڕوومدا زمانی درێژ دەبزوێت ..
چۆن ئافرەتێک بە تەنها بەبێ پیاو دەژی ؟ بۆچی دەچێتە دەرەوە ؟ بۆچی دەچێتە ژورەوە ؟ بۆ پێدەکەنێت ؟ بۆ هەناسە دەدات ؟ بۆ هەوا هەڵدەمژێت؟ بۆ سەرنجی مانگ دەدات ؟ بۆچی سەری بەرزە ؟ بۆ چاو هەڵدەبڕێت ؟ بۆچی وا بە دڵنیایی و متمانەوە پێی لە زەوی گیر دەکات ؟ شەرم ناکات ؟ ئەی بۆ ناچێتە ژێر سایەی پیاوێک ؟ کەسوکار هەموو پێیان وتم .. دۆستان و خۆشەویستانیش بێ توانج نەبوون بەرامبەرم .. لە بەرامبەر ئەم زریانەدا ڕاوەستام ..
لە منداڵیمەوە زنجیرەیەك جەنگی بێ کۆتایی ئێخەی گرتووم ..
ئێستاش ئەوەتام لە جەنگێکی نوێدا .. جەنگ لەگەڵ کۆمەڵگە .. کۆمەڵگەی گەورە .. ملیۆنان لە خەڵکی .
بۆچی کار و بار و دۆخەکان ئاسایی و وەکو خۆی لە ژیاندا بەڕێوە ناچن ؟ بۆ نابێت هەستکردن و تیگەیشتن هەبێت لە ڕاستی و یەکسانی ؟ بۆ دایکان دان بەوەدا نانێن کە کچ وەك کوڕە ؟ بۆ پیاو

دان بەوەدا نانێت کە ئافرەت هاوبەشە و بەشەکەی تریشە ؟ بۆچی کۆمەڵگە دان بە مافی ئافرەتدا نانێت لە پیادەکردنی ژیان بە ئاسایی وەك مێشک و جەستە ؟ بۆ تەمەنم لەم شێوە جەنگەدا بەهەدەر دەدەن ؟
سەرمکردە سەر دەستم و بیرم دەکردەوە .. ئایا ئەم جەنگە ئەنجام بدەم لەگەڵ کۆمەڵگەی گەورە یان ملی بۆ کەچ بکەم و دوای بکەوم ؟ خۆم بشارمەوە و بچمە ژێر سایەی پیاوێکەوە لەنێوان چوار دیواردا وەك چۆن زۆرێک لە ئافرەتانی دیکە ؟
نەخێر .. مەحاڵە ! ملکەچی کۆمەڵگە نابم .. هەرگیزیش دوای ناکەوم .. نانم .. زانستم .. سەرکەوتنم ..

* * *

لە هەموو شتێک گەرم .. لە کەسوکار و هاوڕێیان گەڕام . پیاوان و ئافرەتانم جێهێشت .. خواردن و خواردنەوەم واز لێهێنا .. خەو و خەون بینینم بیر خۆم بردەوە مانگ و ئەستێرەکانم جێهێشت .. ئاو و هەوام واز لێهێنا .. ئامێری بیستنەکەم کردە گوێم و چاکەتە سپیەکەم لەبەرکردوو لە نۆڕینگەکەم ڕاوەستام .. بڕیارمدا تێبکۆشم .. هەوڵبدەم .. عەرەق بکەمەوە و تیایدا نوقوم ببم بڕیارمدا لەبەردەم کۆمەڵگەدا بەدوو پێی ئاسنینەوە ڕابوەستم .. خۆیکرد بە نۆڕینگەکەمدا و جەستە بچکۆلانەکەی لە ترسان هەڵدەلەرزی سیمای لە ڕوخساری منداڵێکی بێتاوانی دەکرد .. سەرنج و تێڕوانینەکانی بۆم داوای فریاکەوتن و بەزەیی و سۆزی لێ بەدیدەکرا .
لێم پرسی : چیتە بچکۆلانەکەم ؟
دایە پرمەی گریان .. توانیم لەنێوان لێوەکانیەوە چەند وشەیەکی تاکو تەرای بچڕاو وەربگرم .

دەستی بڕیم .. گورگ .. سەعید .. دەمکوژن .. کەسم نیە .. فریامکەوە .. دکتۆرە !
دەستەسڕی پێنەبوو ئەوی خۆممدایە .. چاوەڕوانیمکرد تاکو چی لە دڵە بچکۆلانەکەیدابوو لە لە فرمێسك و هەنسك هەڵیڕشت و وشکی کردەوە سەرنجی دەمو لێوی دەدام تاکو بزانێت کاردانەوەم چی دەبێت چونکە وەڵامی من بۆی بە واتای سزای مردن یان ژیان دێت ..
سەرنجێکیمدا منداڵێکی ( چواردە بۆ پانزە ) ساڵان دەبوو .. بێتاوان و پاك و بێکەس بوو .. هیچ بوارێکی هەڵبژاردنم نەما .
چۆن دەتوانم گوێی نەدەمێ لە کاتێکدا جگە لە من کەسێکیتر شك نابات !
چۆن دەتوانم سزای سێدارەی بەسەردا بدەم دەشزانم کە بێتاوان و پاکە و مافی ژیانی هەیە .. چۆن دەتوانم ملی بخەمە ژێر چەقۆی پیاوێک لە کاتێکدا دەزانم کە هەریەك لە باوك و دایك و براو مامی تاوانبارن .. چۆن دەتوانن بە تەنها سزای ئەم بدەن ؟ لە کاتێکدا تەواوی کۆمەڵگە لەم تاوانەدا بەشدارن . چۆن دەبێت کەوتنە هەڵەیم بەلاوە سەیر بێت ؟ لە کاتێکدا دەزانم کە هەموو خەڵکی دەکەونە هەڵەوە .. چۆن ناپیارێزم لە کاتێکدا ئەم قوربانیە و کۆمەڵگەش تاوانبارە ڕاستەقینەکە حەشار دەدات ؟ چۆن کەوتنیم بەلاوە سەیر بێت کە خودی خۆشم کەوتمە هەڵەوە ؟ .. منێک کە دوو هێندەی ئەو بەتەمەنم , دوو هێندەی ئەو شتم بینیوە و دوو هێندەش فێربووم .. چۆن ڕزگاری ناکەم وەك چۆن پێشتر خۆمم ڕزگار کرد ؟
دەبێت هەرچۆنێک بێت ئەم منداڵە ڕزگار بکەم ! ڕزگاری بکەم لە بێبەزەیی و چنگی نەریت و یاسای بۆگەن لەژێر چەپۆکی دێو و مار و جرج و مێرووەکان دەریبهێنم ..
من ئیدی فریای دەکەوم .. با گەر ویستیان لە خاچم بدەن .. لە خاچم بدەن .. با بەردەبارانم بکەن گەر ویستیان .. با بەرە و سێدارە

ڕاپێچم بکەن گەر بە نیاز بوون .. بەڵام من چارەنووس و دوا ساتەکانی ژیانم بە ئاسودەیی دەبەمە سەر .

* * *

هەموو نەهامەتیەکانی کۆمەڵگە هاتونەتە نۆڕینگەکەم .. هەموو شاراوە و ساختەیەك لەبەردەممدا لەسەر مێزی پشکنین ڕاوەستاوە ..
هەموو ئەو ڕاستیە تاڵانەی خەڵکی ڕەتیدەکەنەوە هاتونەتە سەر مێزی نەشتەرگەرییەکەم .. بەزەییم بە خەڵکیدا هاتەوە ..
ئایا ئەو پیاوەی لەسەر هەڵەیەك خوشکەکەی خۆی سەر دەبڕێت خودی خۆی لەگەڵ خوشکی پیاوانی تردا هەڵە ناکات؟
ئایا ئەو گورگەی فێڵ لە منداڵێکی بێتاوان و پاك دەکات خودی خۆی ئەو باوکە نیە کە منداڵەکەی بەند دەکات و دەستبەسەری دەکات ؟
ئایا ئەو ئافرەتەی بە دزی هاسەرەکەیەوە ناپاکی لەگەڵ پیاوێکی تردا دەکات خودی خۆی هەمان ئەو ئافرەتە نیە کە بوختان بۆ ئافرەتانی دیکە هەڵدەبەستێت ؟
ئایا ئەو کۆمەڵگەیەی گۆرانی خۆشەویستی و عەشق پەخش دەکات ڕێگە خۆشکەرە بۆ بڵاوبونەوەی خۆشەویستی و ڕاهاتن بەو عیشقە هەمان کۆمەڵگە نیە قەنارە بۆ هەموو ئەوانە هەڵدەدات کە کەوتونەتە خۆشەویستی و عەشقەوە ؟
بەزەییم بە خەڵکیدا هاتەوە .. هەموو خەڵکی ئەوان هەموو قوربانی و هاوکات تاوانبارن .

* * *

نۆڕینگەکەم پڕبوو لە ئافرەتان و پیاوان و منداڵان .. قاسەکەم پڕبوو لە پارە و ئاڵتون .. وایلێهات وەك ئەستێرە ناوەکەم دەدرەوشایەوە .. ڕاوبۆچونەکانم وەك دەستورێك بەسەر خەڵکیدا بڵاودەکرایەوە .. لە خەڵکانی بێگانە و نەناس خزمم بۆ پەیدا دەبوو

.. دوژمنان بوونە هاوڕێ و خۆشەویست .. پیاوان لە دەورم وەك مێش زۆر بوون ..سەرجەم گلەیی و گازندەکان گۆڕان بە پشتگیری و بەرگریکردن .. چاوی مێزەکەم پڕبوو لە باس و خواسی چاکە و فریاکەوتن و ئامۆژگاری و تکا کردن پاشان لەسەر ئەو لوتکە بەرزە دانیشتم و سەرنجی کۆمەڵگەکەم دەدا لەژێر پێکانمەوە ..
دواتر لە ڕوانگەی بەزەییەوە زەردەخەنەیەکم بۆ کرد .. کۆمەڵگە ! ئەو جەللادە بەهێزەی قوڕقوڕاوگەی ئافرەتان دەگرێت و ڕاپێچیان دەکات بەرەو چێشتخانە و قەسەبخانە و گۆڕ و قوڕاوەکان !
ئەوەتا ئەوە کۆمەڵگە لە چاوی مێزەکەمدا داوای بەزەیی و فریاکەوتن و بەهاناچوون دەکات ! ئای ئەو کۆمەڵگە گەورەیە چەند بچووکە !
دوای چوونە دەرەوەی دوا نەخۆش لە نۆڕینگەکەم دانیشتم و پاش ئەوەی پەرستارەکەش ڕۆیشتەوە ..
بە تەنیا دانیشتم و سەرنجی کاتژمێرەکەم دەدا .. هێشتا کاتژمێر نۆی شەوە سەرەتای شەوە .. ژیان بە قورسی بەڕێوەیە ..
هەستامە سەرپێ و دەستمکرد بە پیاسەکردن بە ژوورەکەدا .. گەیشتمە لای پەنجەرەکە و شەماڵێکی گەرمی شەوی سیحراوی لە ڕوخساریدام ..
سەرنجێکی شەقامەکەمدا بینیم خەڵکی بەیەکەوە نوساون و دەڕۆن وقسە دەکەن و پێدەکەنن .. سەیرێکی خۆمم کرد هەستمکرد بەسەر سەریانەوەم .. لە بەرزاییەکەوە .. بەڵام دوور ..
هەستم بە سەرمایەکی زۆر کرد وەك ئەوەی لەسەر لوتکەیەکی سەهۆڵین دانیشتبم .. سەرنجی سەروو خۆم دەدەم جگە لە هەور و ئاسمان هیچیتر نابینم .. ژێر پێکانیشم زۆر دوورە لە دەشت و نشێوەکان .. دوورم لە نزمایی گەرم بە هەناسە و جەستەی مرۆڤ .. خەڵکی دەبینم بە دەستەکانیان سەرنجم ڕادەکیشن بەڵام نامگەنێ .. ئاوازەکانم بۆ دەچڕن بەڵام ناگەنە گوێم .. گوڵم بۆ هەڵدەدەن بەڵام

هەڵاڵەکان لە هەوادا وون دەبن .. سەرمکردە سەر لێواری پەنجەرەکە ..
چەند ساردە تەنیایی ! بێدەنگی چەند دڵ ڕەقە ! چی بکەم ؟ لەسەر ئەو بەرزاییە خۆم فڕێدەم ؟ بەڵام زۆر چاك ملم دەشکێت .. بگەڕێوە دواوە !
بەڵام تەمەنم بەسەر دەچێت و ناگەمە ئەوەی دەمەوێت .. جەنگ کۆتایی هات و کاتی ئەوە هاتووە بەبێدەنگی و بێ جووڵە دابنیشم ..
ئاە .. بەتاڵی چەند ناخۆشە .. !
بۆچی بەسەر پەیژەی ژیانمدا بازمدا ؟ بۆ پێکی ژیانم پێك لە دوای پێك هەڵنەدا ؟ بۆچی تەمەنم قۆناغ بە قۆناغ بەسەر نەبرد ؟ بۆچی هەموو یاریەکانم بە یەك باز نەبڕی ؟ بۆ جێگەی خۆمم جێهێشت ؟
پۆلی خەڵکی بە سنگە خشێ بەڕێوەیە .. وەك کیسەڵ , وەلێ ڕۆژێک ئەوانیش دەگەنەجێ .. ژیانیش بەرەو پێش دەڕوات .. هەرچەندە لەسەرخۆ دەڕوات بەڵام ڕۆژێک هەر دەگات بە خواستەکانی .. ملیۆنان ساڵ تیپەڕیووە تاکو ئەو پەڵە هەورە بۆتە هەوا .. تا هەوا بۆتە ئاو و تا ئاو بۆتە سەهۆڵ .. ملیۆنانی دیکە تێپەڕیووە تا ئەو سەهۆڵە بۆتە ئەمیبایەکی جوڵاو و تا ئەو ئەمیبا جوڵاوە زیادەی زیندووی دەرکردووە .. ملیۆنانی تر تێپەڕیکردووە تاکو ئەو زیادانە گوێ و باڵیان دەرکردووە دواتر کلك .. ملیۆنانی دیکە تێپەڕی تا ئەو زیادانە پەنجەیان دەرکردوو کلکەکە نەماوە وەك مەیمون لەسەر دوو پێ وەستا..
بۆچی لە منداڵیمدا پەژارە دایدەگرتم لەسەر ئەوەی وەك کۆتر بە ئاسماندا نەمدەتوانی بفڕم ؟ بۆ قینم لەو سێ ڕۆژە بوو کە ئافرەتی پیس دەکرد ؟ بۆچی لە مێژوو یاسا و نەریت یاخیبووم ؟
بۆ نیگەران بووم لەبەرئەوەی زانست نەیتوانی نهێنی ( پرۆتۆپلازم ) ی زیندوو بدۆزیتەوە ؟

ساڵان تێدەپەڕن و زەمەن و مێژوو یاسا و نەریت دەگۆڕێت .. ساڵان تێدەپەڕن و ژیان ڕێگەیەکی خاوێن و جوان دەدۆزێتەوە کچانی بچکۆلانەی پێ بگەیەنێت .. ساڵان تێدەپەڕێت و جەستەی مرۆڤ هێندە سووك دەبێت توانای فڕینی دەبێت .. ساڵان تێدەپەڕێت و زانست دەگات بە نهێنی ( پرۆتۆپلازم ) ی زیندوو .. زەمەن بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتن و ژیانیش ڕۆژانە شتی نوێ دەدۆزیتەوە . بۆچی زەمەن لە ئاستی مندا هێواش بووە و تەمەنی بەهەدەر دام ؟

بۆ ژیان پێش خۆیدام و فڕێیدامە سەرەوە .. بۆ لوتکەیەکی بەڕاستی بەرز بەڵام تەنیایی تەنیویەتی و سەهۆڵ دایدەپۆشێت..

ئاه .. چەند دڵ ڕەقە بێدەنگی ؟ چەند ناسکە دەنگی مرۆڤ هەرچەندە قەرەباڵخ بێت .. تەنیایی چەندە ساردە ؟ هەناسەی خەڵکی چەندە گەرمە گەر نەخۆشیش نەبن .. خامۆشی چەندە ناشرینە ! جووڵە چەند جوانە گەر جەنگیش بێت .. بەتاڵی چەندە ناخۆشە ! بیرکردنەوە و سەرقاڵی چەندە خۆشە گەر شکستیش بێت .

* * *

بەتاڵی ناخی داگیرکردووە و ئەو زەبەلاحەش دەستی بە جووڵە کرد ..

قەرەباڵخی و سەرقاڵی ناخم کۆتایی هات و زەبەلاح دەستی بە جموجۆڵکرد .. چیت دەوێت ؟ لە هەموو شتێک یاخی بووم و لە ژیانی ئافرەتانیش بە هەمان شێوە .. بەدوای ڕاستیدا گەڕام گەیاندمیە ئەوەی کە بە داخراوی و بێدەنگی بمێنمەوە .. هەموو پیاوانیشم تاقیکردەوە ..

چیت دەوێت ؟ پیاوێک لە دالْغە و خەیاڵدا بژی و بەزەویدا نەڕوات ! پیاوێک قسە بکات و بیربکاتەوە و جەستەی پیاوی نەبێت دەتوانێت لەبیری بکەیت .. ئەو لاشە فڕێدراوانەی سەر مێزەکانی هۆڵەکانی (

توێکاری ) ؟ ئەو پرخە ناخۆشەی نزیك سەرینەکەت , ئەو تێڕوانینە نیگەراناوی و هەژارانەیە , ئەو مردنەی منداڵان لەناو دەبات ؟
دەرگای زیندانەکە لەسەرخۆت دابخەرەوە و جارێکی دی بنورەوە !
بەڵام شەو درێژبوو .. خەیاڵەکانی شەوانیش ڕیزیان بەست لە نزیك جێگەکە .. جێگەکەش فراوان و سارد و ترسناك .. زەبەلاحەکەش نایەوێت بنوێت .. سەرکەوتنیش هیچ چیژێکی نیە .. ناوبانگیش هیچ واتایەکی نیە .. پارەش چەند وەرەقەیەکی بێ گیانە ..

*          *          *

لە نێوان ئەو نامە و پارانەی لە چاوی مێزەکەمدا بوو بلیتێکی بچووکم بینی .. دەستم برد هەڵمگرت .. بینیم بانگهێشت کراوم بۆ ئاهەنگێکی خوانی ئێوارە .. خێرا هەستام و سواری ئوتومبیلەکەم بووم بەرەو شوێنی مەبەست .. چوومە هۆڵە بەرینەکە .. ڕووناکی پرشنگدار و ڕەنگاو ڕەنگم بینی و ئامادەبوان جلوبەرگی جوان و ئوتوکراویان پۆشیووە .. چەندین ڕوخساری ناسراوم بینی .
چاوم گێڕا بەناو خەڵکەکەدا وەك ئەوەی بۆ شتێکی دیاریکراو بگەڕێم .. بینیم پیاوان بە لاچاو سەرنجی ئافرەتان دەدەن .. ئافرەتانیش بە هەمان شێوە .. بە نێوانیاندا بەسەر لەقاندن ڕۆیشتم .
لە ناکاو بینیم خەڵکەکە لە دەوروبەری کابرایەکی کورتە باڵای قەڵەو کۆبونەتەوە .. هەمووان دەیانەوێت لێی نزیك بن .. هەمووان دەیانەوێت لە وێنەکەدا لەگەڵی دەرکەون .. هەمووان دەیانەوێت لە شاشەی تیڤیەکاندا لەگەڵی دەرکەون .. هەمووان بەنیازن دەنگ و ڕەنگ و ڕوخساریان دەرکەوێت .. بونیان هەبێت .. لەم قەرەباڵخیە دورکەوتمەوە و گۆشەیەکی بێدەنگم هەڵبژارد .. لامکردەوە بینیم پیاوێک وەستاوە .. پیاوێکی ئاسایی .. دەستێک جلوبەرگی ئاسایی لەبەردایە .. زۆر بە ئاسایی وەستاوە .. کورت نیە و درێژیش نیە ..

لاواز نیە و قەڵەویش نیە .. بەڵام هەستمکرد کە شتێکی نائاسایی تێدایە .. ڕوخساری ئاسایی جیاوازی لەگەڵ ئەوانیتر دروستکردووە .. لەوانەیە ڕێکوپێك بێت سەرباری ئەوەی کە زۆر سادەیە .. لەوانەیە وەك ئەو خەڵکە خۆی لەو کابرایە نزیك نەکاتەوە .. لەوانەیە .. لەوانەیە .. ئەویش لایکردەوە بەلامدا و .. چاوی لەسەرم جێگیر کرد .. هەستم بە ورووژانێکی سەیر کرد لە ناخمدا .. بە چاو زەردەخەنەیەکی سووکی هێمنانەی کرد ..

بە دەنگێکی هێمن بە جوڵەی چاوی وتی :

- ئەوان بەدوایدا ڕادەکەن ..

زۆر بە سادەیی لێم پرسی : بۆچی ؟

وتی : ئەوە سەرۆکی دەستەکەیە .

بە هەمان تێڕوانینەوە سەرنجی خەڵکەکەی دەدا .. دەبێت سەرنجی بەزەییانە بێت یا گاڵتەجاڕی ؟

ئایا تێڕوانینی ڕێزە یان سوکایەتی ؟ تێنەگەیشتم ..

جارێکیتر لایکردەوە بەلای مندا .. سەرنجێکی قووڵی چاوەکانیمدا زۆر بە سادەیی خۆی پێ ناساندم و بە هەمان شێوە منیش خۆم پێ ناساند ..

بە دەستی مێزێکی تاکی دەستنیشانکردوو وتی : با لەسەر ئەو مێزە دانیشین ئەمە دورترین مێزە لە سەرۆکی دەستەوە ..

دواتر پێکەنی و منیش پێکەنیم .. بەیەکەوە چوینە لای مێزەکە و بەرامبەر یەکتر دانیشتین .. پاشان سەیرێکی قاپ و قاچاخی سەر مێزەکەی کردوو ئینجا سەیرێکی منیکردوو وتی : من نازانم دەستوری ئاهەنگ چۆنە ؟.

هاوکاریت بکەم ؟

چاوی ئەم پیاوە چی تێدایە ؟

پێموت : نەخێر .. سوپاست دەکەم .. من دەستور و نەریتی ئاهەنگەکانم پێ خۆش نیە .. دواتر بەبێدەنگی دەستمانکرد بە خواردن .. پاش کەمێك وتی : کاتت هەیە بۆ گوێگرتن لە موزیك ؟
وتم : کەمێك .. دوا ئاوازتم گوێ لێ نەبووە بەڵام ئاگاداری سەرکەوتنی هەم و خەڵکیش پێیان باشە .
تێڕوانینەکانی لەمن دورکەوتنەوە و پاشان سەیرێکی کردم و وتی : لێی ڕازی نیم .
وتم : بەڵام جەماوەر پێی ڕازیە .
وتی : هونەرمەند ناحەویتەوە تاکو خودی خۆی بە کارەکەی قایل نەبێت .
وتم : ئەی بۆچی ئەو ئاوازە پەخش دەکەیت کە وا لێی ناڕازیت؟
وتی : ئەمەیە ئازارم دەدات .. ئەوەی من پێی قایل دەبم جەماوەر تێی ناگات .
وتم : ئەی بۆ ئەو ئاوازانە دانانێیت کە خۆت پێی قایلیت بێ گوێدانە جەماوەر ؟
وتی : ئەی کێ گوێی لێ بگرێت ؟
وتم : کەمێك .. تەنها یەکێک .. بەڵام ئەوە باشترە لە قایلکردنی جەماوەر بە هەر شێوەیەك .
وتی : زۆرجار وا دەکەم .
سەری داخست و پاش کەمێك بیرکردنەوە سەری بەرزکردەوە و وتی :

- لەبارەی موزیکەوە زۆرمان ووت ئەی تۆ بۆ باسی تەندروستی و پزیشکایەتی ناکەیت ؟

وتم : وتوێژ سەبارەت بە پزیشکایەتی لەگەڵ دۆخی ئاهەنگەکەدا ناگونجێت .. بەسەرسوڕمانێکەوە وتی : بۆچی ؟
وتم : ئەوە وتوێژێکە سەبارەت بە نەخۆشی و ئازار .. دەربارەی غەمباری ژیانە .

وتی : هەرگیز .. ئازارەکان گەورەن , بەڵام ئاسودەیی گەورەترە .. من دەتوانم بزانم چەند هەست بە ئاسودەیی دەکەیت کاتێک مرۆڤێک لە مردن ڕزگار دەکەیت .. ئەوە بەختەوەرترین و ئاسودەترین ساتەکانی پزیشکە لە ژیانیدا .

وتم : ئەی ئاسودەترین ساتەکانی هونەرمەند چیە ؟

وتی : ئەو کاتەی ئاوازێک دادەنیم لێی ڕازی بم .. یان کاتێک گوێبیستی ئاوازێکی باش دەبم . پاشان سەرنجێکی قوڵی زەردەخەناویدام .

وتی : یان کاتێک هاوڕێیەکی نوێ دەدۆزمەوە .. ویستم خۆم لەو تێڕوانینە لادەم . بەڵام ڕێگەی نەدام خۆمی لێ بدزمەوە .. هەستمکرد سەرنج و تێڕوانینەکانی تەواو بەستومیەتیەوە .. دڵم ترپەیەکی گەورەی کرد .

*        *        *

لەناو جێگەکەمدا عەرەقێکی زۆرم کردبوەوە و هەر ئەمدیو و ئەودیوم بوو .. ناو جێگەکەم زبر بووە پڕی زیخ و بزمار بووە..

لە جێگەکەم هاتمەدەر و دەستمکرد بە پیاسەکردن لە ژورەکەمدا .. هەستمکرد ژورەکەم تەنگەبەرە وەك زیندان و هەواش خنکینەرە وەك پەتی سێدارە .

چوومە دەرەوە بۆ تارمەکە بەڵام توانای وەستانم نەبوو .. دانیشتم .. لە دانیشتن بێزاربووم .. هەستامە سەرپێ و چوومە ژوری نانخواردن .. هەوڵمدا شتێک بخۆم , بەڵام تام و چێژی خواردنەکە زۆر سەیر بوو وەك ئەوەی لە ( لاستیك ) دروستکرابێت .. واملێهاتووە لە هەموو شتێک بێزارم .. نە دانیشتن و نە وەستان , نە پیاسەکردن , نە نوستن واملێهاتووە چێژی هیچ شتێک ناکەم .. نە خواردن نە ئاو و نە هەوا .. ئەو شتانەش کە کاتیان دەبردم ئێستا بێ

کەڵك و بەتاڵن .. ئەو شتانەی گرنگیم پێدەدان و ڕۆژیان دەبردم ئەم هەستە نوێیەم لەناوی برد ..
تەنها پرسیارێک بە مێشک و ڕۆحمدا دەهات ..
ئایا داوای بکەم ؟ قسەی لەگەڵ بکەم ؟ من دەست بە قسە بکەم ؟
ئنجا سەرنجم چوو بەلای ئەو ئامێرە بچکۆلانەیەدا .. ئەو شتە چوارگۆشە ڕەشەی بە دەستێک لێرە بۆ ئەوێ دەیبەم.. بە پەنجەیەك بەکاری دێنم هەرکات ویستم .. ئێستا ئەو شتە بۆتە کێشەیەکی سەیر .. ئامێرێکی جادویی ترسناك .. بە وریاییەوە و لە دوورەوە سەرنجی دەدەم .. بە ترسێکەوە لێی نزیك دەبمەوە .. کاتێک پەنجەی لێدەدەم مێشک و دڵم وزەیەکی سەیری پێدادێت وەك ئەوەی دەستم بەر وایەرێکی کارەبایی ڕووت بکەوێت .. ئایا شتەکان بەو شێوەیە دەگۆڕێت کاتێک تێڕوانینی ئێمە بۆیان دەگۆڕێت ؟
لە نزیك ئامێری تەلەفۆنەکە دانیشتم . بیرم هاتەوە .. وشەکانیم بیرکەوتەوە کاتێک .. ژمارەکەی پێدام , وتی : هەرکات ویستت پەیوەندیم پێوە بکە ..
ئەو ڕێز لە ویستی من دەگرێت .. کەوابوو باڕێز لە ویستم بگرم ! من بەردەوام ڕێزم لە ویستم گرتووە .. ئەی ویستم بەڕێوەم نابات ؟ .. پیاوێک هەوڵی نەدا ژیانم بۆخۆی بەرێت منیش بە کەسم نەدا چونکە نەمویست ! پیاوێک هەوڵی نەدا ژیانی خۆیم پێشکەش بکات منیش هیچم لێوەرنەگرت چونکە نەمویست , ئایا ویست و ئیرادەم وەرگرتن و پێدانم دیاری ناکات ؟ .
من ئێستا دەمەوێت بیبینم .. بەڵێ دەمەوێت .
پەنجەم ( شەش ) جار بازنەی ئامێرەکەی سوڕاند .. پاشان دەنگی زەنگەکە ڕۆیشت لەناکاو زەنگەکە بڕاو خەریکبوو دڵم بوەستێت گوێم لە دەنگە قوڵەکەی بوو دەیوت : بەڵێ , ئەلوو .
بیرم لە هەڵسوکەوت و شێوازی نازکردن نەکردبوەوە .. وەك ئافرەتانی دیکە بەپێچ و پەنا نەبووم .. خۆم وا نیشان نەدا کە تەنها

بۆ پرسیارکردن تەلەفۆنم کردبێت .. خۆم بە گێلی و نەزانی نیشان نەدا .. بەڕاستی و بێ پێچ و پەنا وتم : دەمەوێت بتبینم .

- کەی ؟
- ئێستا .
- لەکوێ ؟
- هەر شوینێک بێت .. شوێن گرنگ نیە .
- ئێستا تۆ لەکوێی ؟
- لەماڵەوە .
- دوای کەمێکیتر دەگەمە لات .

لەسەر کورسیەکەم دانیشتم وەك ئەوەی ژیان لە جەستەمدا نەمابێت ..

بەملاولای خۆمدا ڕوانیم سەرنجی کەلوپەلی ناو ماڵکەم دەدا وەك ئەوەی یەکەمجار بێت بیانبینم .

بزێوی و چالاکیەکی سەیر هات بە جەستەمدا ..

دەبێت ئەم وێنەیە لێرە لابدەم .. ئەم کورسیە بخەمە ئەوێ .. ئەو گوڵدانە پڕبێت لە گوڵ .. خزمەتکارەکەم نارد چەپکێک گوڵ بکڕێت .. چاکەتم لەبەرکردوو لە چێشتخانە وەستام .. کێکێکم بە شیر و هێلکە دروستکردوو کردمە فڕنەکەوە .. قاڵبێك جەلیم دروستکردوو کردمە بەفر گرەکەوە .. واملێهات وەك منداڵێکی بچکۆلانە ڕامدەکرد لە فڕنەکەوە بۆ بەفر گرەکە .. لە بەفر گرەکەشەوە بۆ گوڵدانەکە و دواتر بۆ وێنەی سەر دیوارەکە .. لەوێشەوە دووبارە بۆ فڕنەکە ..

عەرەق بە ڕوخسارمدا دەهاتە خوار ڕێچکەی بەست بۆ ناو دەمم , بەڵام چێژێکی خۆشی هەبوو .. سنگم هەڵبەز و دابەزی بوو لە ئەنجامی هەناسە بڕکێم وەك ئەسپێک لە پێشبڕکێدا من بیرم چوبوو کە تەنها دوو سێی هەیە .. دەستم خستە ناو فڕنەکە هەستم بە پێوەدانی ئاگرەکە نەکرد وەك ئەوەی خانەکانی مێشکم ئازاری

سوتانیان بیرچوبێتەوە .. پشتم بە چەماوەیی لە ژێر مێز و کورسیەکان و کشانی بۆسەر ڕەفە بەرزەکان وەك ئەوە وابوو کە بڕبڕەی تیدا نەمابێت .. زەنگی دەرگا لێیدا بەڵام چۆن لێدانێک زەنگێکی سەیری سەرسوڕهێنەر وەك ئەوەی یەکەمجار بێت گوێبیستی زەنگی دەرگا ببم لە ژیانمدا ..

* * *

لە ژووری میوان دانیشت و بە قووڵی چاوەکانی بە وێنەی سەر دیوارەکان و ژورەکەدا دەگێڕا , منیش هێندە لێی دوور نەبووم دانیشتبووم .. دەمەوێت ئەو هەستە سەیرەی ناخمی داگیرکردووە بشارمەوە .. دەمەوێت ئەو شادی و خۆشیەی دڵی تەنیوم خەفەی بکەم و بیشارمەوە .. بەڵام ئەفسوس .. چاوەکان بە تێڕوانینە سەیرەکان ئاشکرام دەکەن .. لێوەکانم و دەنگی پچڕپچڕ و تەتەڵە کردنم لە قسەکردن بە درۆم دەخەنەوە ..

بە ناسکیەکەوە زەردەخەنەیەکی کردوو وتی :

- ماڵەکەت خۆشە .. ماڵی هونەرمەندە ..

وتم : من حەزم لە هونەرە بەڵام پزیشکایەتی هەموو کاتی بردووم ..

وتی : پزیشکیش خۆی لەخۆیدا هونەرە ..

پاشان سەرنجێکیدام ..

چاوی ئەم پیاوە چی تێدایە ؟ دەریایەکی قووڵ !

وتم : چا ناخۆیتەوە ؟ بە شێوەیەکی هێمنانە و ئاسایی سەرێکی لەقاند جێمهێشت و چووم چا ئامادە بکەم .. خزمەتکارەکە زۆری بەلاوە سەیربوو کە لەوەتەی هاتۆتە ماڵەکەم یەکەمینجارە لە چێشتخانە دەمبینێت شتێک ئامادە بکەم .. فڕنەکەم کردەوە و کێکەکەم دەرکرد پارچەیەکم لێکردەوە و خستمە سەر قاپێك لەگەڵ

چاکە دامنا و گەڕامەوە بۆلای سەرنجێکی کێکەکەیدا تازە و پاراو دیاربوو هێشتا مابوی سوور بێتەوە .
زەردەخەنەیەك گرتی .. بەڵام نەمتوانی خۆمڕاگرم دەستمکرد بە پێکەنین و ئەویش پێکەنی .. بە یەکەوە زۆر پێکەنین وەك ئەوەی بمانەوێت بۆ هەتایی پێبکەنین .. پێکەنینە ئاساییە بێ سنورەکان ئەو بەربەستە تەنکەی شەرمی نێوان هەردوکمانی پساندوو بینیم بە قوولی سەرنجم دەدات دواتر وتی : هەرگیز ئافرەتی وەك تۆم نەبینیووە .. وتم : بۆچی ؟ وتی : ئافرەتان بەردەوام و هەمیشە هەستەکانیان بە بەربەستی ئەستوور خەفە دەکەن و دەشارنەوە .. بەڵام تۆ هیچ ناشاریتەوە .. تەنانەت ئارایشتیشت لە ڕوخسارت نەداوە .. وتم : من ڕاستی خۆمم خۆشدەوێت متمانەشی پێدەکەم و ناتوانم بیشارمەوە .
وتی : من ئافرەتی ڕاستڕەو و ڕاستگۆم خۆشدەوێت .
وتم : زۆرێک لە پیاوان وا هەست دەکەن کە ڕاستگۆیی مێینەیی ئافرەت دەشێوێنێت .. ئەوان ئافرەتی شاراوە و دەستی بە دەستکارییان حەز لێیە ڕاو ڕاوێنیان لەگەڵدا دەکەن .
وتی : ئەوانە لە ئافرەت تەنها چێژیان دەوێت .
وتم : کەمێك لە پیاوان لە مێینەیی ئافرەتی ژیری خاوەن کەسێتی پتەو دەگەن .
وتی : من وا هەست دەکەم کە ئافرەت هەرچەند جوان بێت گەر کەسیتی لاواز بێت یان دەستکرد بێت ئەوا مێینەیی لەدەستدەدات .
وتم : ئەی سەبارەت بە پیاوێتی ؟
وتی : زۆرێک لە ئافرەتان لە پیاوێتی تەنها توانای سێکسی تێدەگەن .
وتم : گەر پیاو ڕووکەش بێت یان کەسێتی لاواز بێت بەبۆچونی من توانای سێکسی سفرە .

سەیرێکی کردم و وتی : تۆ ئەم هەموو ساڵەی ڕابردوو لە کوێ بووی ؟

- سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووم .
- لەسەر چی ؟
- لەسەر هەموو شتێک .
- ئەوەی دەتویست پێی گەیشتیت ؟
- ئەوەی دەمەوێت هەرگیز پێی ناگەم .
- ئێمە هەرگیز بەو شتانە ناگەین کە بە هیواین لە ژیاندا.
- بەردەوام لە گۆشەگیریدا ژیاوم .
- گۆشەگیری ژێکانی مێشکمان پتەو دەکات بە شێوەیەك بتوانین ئاوازی پێ دابنێین . بەڵام تێربوون تەمبەڵ و تووشی خاوبونەوەی دەکات . قسەی لەگەڵ دەکردم .. بەردەوامیش سەرنجی دەدام .. تەنها جارێکیش نەمبینی سەیری قاچەکانم بکات .. جارێک نەمبینی بەلاچاوێک سەرنجی سنگ و بەرۆکم بدات .. بە تەنیاش بوین .. لەنێوان چوار دیواردا .. بەڵام هەستم نەکرد ئەو چوار دیوارە ببینێت .. ئەو بە ئاسمانی بەریندا لە باڵیدابوو منیش بەخوێن و گۆشتەوە لە نزیکی دانیشتبووم .. بەڵام هەستم نەکرد کە ئەو لەگەڵ جەستەم بدوێت .. ئەو وتویژی لەگەڵ دڵ و مێشکم دەکرد ..

ئیتر چاوەکانم بە هێمنی لێکنا ..

لە نزیکی دانیشتم سەرنجی دەست و پەنجە درێژ و ژیرەکانیم دەدا کاتێک بە لێهاتویی و متمانەوە کەماچەکەی بە دەستەوە دەگرت , ئاوازەکان بەرز و نزم دەهاتنە گوێم .. خەماوی و شادی بەخش .. بەرز هێمن .. پێکەنیناوی و گریاناوی .. چرکە بە چرکەش دڵم لەگەڵێتی .. بەرز دەبێتەوە و نزم دەبێتەوە سەما دەکات و دەگری .

پەنجەکانی لە لێدان کەوتن .. لێی پرسیم :

- ڕات چیە ؟
- زۆر خۆشە .
- ئەوە تەنها ئێستا ئامادەم کرد .
- شین و خۆشیشی تیادایە .
- ئەمە ژیانی ئێمەیە .
- هونەر چەند جوانە .. خۆزگە فێری موزیك دەبووم تا ئاوازی لەوجۆرەم دابنایە .
- خۆزگە فێری پزیشکایەتی دەبووم تاکو خەڵکیم چاك بکردایەتەوە .
- پزیشکایەتی تەنها چاك دەکاتەوە بەڵام هونەر چاك دەکات و دروستیش دەکات .
- دەتوانیت لە پزیشکایەتیدا نوێکاری ئەنجام بدەیت .. نەخۆشی هەیە تاکو ئێستا چارەسەری نیە .

سەرنجێکیمدا ..

- ئەم هەموو ساڵەی ڕابردوو لە کوێ بویت ؟
- بەدوای تۆدا دەگەڕام .
- تۆ تاقیکردنەوە و ئەزمونت هەبووە ؟
- بێگومان .
- ئەی تۆ ؟
- بێگومان .
- تەنها لە ڕێگەی تاقیکردنەوەوە فێر دەبین .

گوێم لێبوو دەنگێک بە قووڵی بانگم دەکات .. لێی پرسیم : چی لە چاوتدا هەیە ؟

هەستایە سەرپێ .. منیش هەستام .. بەرامبەر یەکتر تەنها هەنگاوێکمان نێوانە .. گوێم لێی بوو وتی : خۆشمدەوێی . هەستم بە هەموو شتێک کرد لە جەستەمدا بەرەو قوڵتر دەڕوات و پاشان بۆ

لوتکه .. زەردەخەنەیەك گرتی .. بەچاو تروکانێک ئەو هەنگاوەی نێوانمانی بڕی و کردمیە باوەش .. منیش سەرم کردە سەر سنگی ..

- ئەو فرمێسکانە بۆچی ؟
- خۆشمدەوێی .
- توند باوەشی پێداکردم .. بەشێوەیەك هزرم لە هزریدا ونبوو , هاتە ناومەوە ..

*        *        *

زەنگی تەلەفۆن لێیدا .. زەنگە پتەوەکەی لە ئاسمانەوە بۆ زەوی فڕێیدام .. چووم و وتم : بەڵێ .

دەنگێکی پەشۆکاوم هاتە گوێ دەیوت : لەمردن ڕزگاری بکە دکتۆرە وا دەمرێت .

دەستمگرت بە بیستەری تەلەفۆنەکەوە و سەرنجێکیمدا .. یەکڕاست وتی :

- نەخۆشە ؟
- بەڵێ .
- دەچیت ؟
- هەر ئێستا .
- لەگەڵت بێم ؟
- ئارەزووی خۆتە .

لە نزیکیەوە لە ئوتومبیلەکەیدا سوار بووم و بەخێراییەکی زۆر دەرچوو ..

گەیشتینە ماڵی نەخۆشەکە .. ماڵ نەبوو , بەڵکو ژورێکی بچکۆلانەی تەڕەشوعاوی لەژێر زەمینێکدا تاریك لەژێر یەکێک لە ئاپارتمانە گەورەکاندا ..

لاوێکی لاوازی باریکم بینی لەسەر دۆشەکێک لەسەر زەویەکە ڕاکشاوە و لە نزیك سەریەوە خوێناوێک هەیە .. بیستەرە پزیشکیەکەم خستە سەر سنگی زانیم کە سیلێتی , ژیانی بەندە بە

بتڵێک خوێنەوە .. بەملاولادا گەڕام .. بینیم لە نزیکمەوە وەستاوە و دەستبەجی وتی :

- چیت دەوێت ؟
- هەر ئێستا بتڵێک خوێن لە بانك . ڕایکرد بۆلای دەرگاکە و دەیوت :
- هەر ئێستا بە ئوتومبیلەکە دەچم دەیهێنم .

لە نزیك نەخۆشەکە لەسەر سنوقێکی تەختە دانیشتم و چەند دەرمانێکم بە ( سرنج ) لێدا .. کەلوپەلی گواستنەوەی خوێنم ئامادەکرد .. جۆری گروپەکەیم دەستنیشانکرد ..

بینیم بە پەلە خۆیکرد بە ژووردا و بتڵێک خوێنیشی پێیە .. خێرا هەستام .. قۆڵی نەخۆشەکەی گرت لە نزیکم مایەوە و هاوکاری کردم تا دەرزییەکەم بردە ژورەوە و جێگیرم کرد ..

سەرنجێکیمدا .. بینیم عەرەق بە ڕوخساریدا دێتە خوارەوە .. سەری زۆر نزیکە لە سەری نەخۆشەکەوە .

بەگوێیمدا چرپاند :

- تکات لێدەکەم دوربکەوە ..
- بۆچی ؟
- با تووش نەبێت و نەیگریت .
- ئەی تۆ ؟
- ئەمە ئەرکی سەر شانمە .. پێویستە لەهەر بار و دۆخێکدا ئەنجامی بدەم ..

بەبێدەنگی سەرنجێکیدام لەجێی خۆی نەجووڵا تا ئامێری خوێن گواستنەوەکەم بەست ..

لەسەر کورسی و سنوقە تەختەکە بەرامبەر یەکتر دانیشتین و سەرنجی دڵۆپی خوێنەکەماندەدا چۆن لە بتڵەکە دێتە دەر بۆ سۆندەکە و دواتر بۆ خوێنبەری نەخۆشەکە .. وەك ئەوەی هاوبەشی لەو ژیان وەبەرهێنانەوەیەدا بکەین کە ئەو دڵۆپە سورانە ئەنجامی دەدەن بۆ

فریاکەوتنی نەخۆشەکە .. سەیرێکم کردوو پێکەنیم .. زەردەخەنەیەکی ناسکی هێمنی کرد ..
وتم : گەر تۆم لەگەڵ نەبویتایە نەمدەتوانی بە تەنیا ئەم هەموو ئەرکە ئەنجام بدەم .
وتی : بە پێچەوانەوە دەتوانی .
پاشان دەستی بۆ بتڵە خوێنەکە ڕاکێشا و وتی :
- تەنها کەمێکی تێدا ماوە .
سەرنجێکی چاوی نەخۆشەکەمدا بینیم چاوەکانی لەیەکەمجار باشترە .. وە هەناسەکانی هێواشتر و لەبارترە ..
دەرزییەکەم لە خوێنبەری دەرکرد .. نەخۆشەکە لێوە وشکهەڵاتوەکانی کردەوە و بە دەنگێکی هێمن سەرنجی داین و وتی : سوپاستان دەکەم دەستی بردە ژێر سەرینەکەی ژێر سەری و بە دەستە باریکەکانی ( یەك ) جونەیهی بۆ ڕاگرتم .. نازانم لەو ساتەدا چیم بەسەر هات .. دونیا لەبەرچاوم سوڕایەوە خەریکبوو لە هۆشخۆم بچم .. هەستم بە دەستێک کرد گرتمی .. بە سۆزێکەوە پێی وتم :
هەست بە ماندوو بوون دەکەیت ؟
سەیرێکم کرد .. نەمزانی چی بڵێم چونکە من هەستم بە هیلاکی نەدەکرد بەڵکو شەرمێکی زۆر و تەریق بونەوە ..
ئایا ئەو هەڵوێستە سەیرەم ڕەتکردەوە ؟ نازانم .. بەڵام لەو ساتەدا هەستمکرد کە نە ڕەوشتە و نە ڕاستە و نە دەبوو و نابێت پزیشك کرێی ماندوبوون لە نەخۆش وەربگرێت .
چۆن ئەو هەموو ساڵە تێپەڕیکردووە و من پارەم لە نەخۆش وەرگرتووە ؟ .. کام پارە ؟ .. من چۆن لە نۆڕینگەکەم تەندروستیم بە خەڵکی فرۆشتووە ؟ چۆن قاسەم بە عەرەق و خوێنی نەخۆشەکان پڕکردووە ؟ ئاە ..

هەستم بە دەستە بەسۆزەکانی کرد گرتومی و خستمیە ئۆتومبیلەکەوە .. بەرەو ماڵەوە بردمی .. بە زەردەخەنەیەکەوە پێی وتم : دوای ئەوەی خستمیە سەر جێگەکەم :

- پزیشکت بۆ بانگ بکەم ؟

هەستم بە فرمێسکی گەرمکرد لەسەر دەموچاوم .. بە هێمنی دەستی گرتم و وتی :

- ئەم فرمێسکانە بۆچی ؟
- هیچ تێنەگەیشتم .
- بۆچی ؟
- من کوێر بووم .
- بۆچی ؟
- من تەنها هەر خۆم بینیووە .
- بۆچی ؟
- جەنگەکان ڕاستیەکانیان لێ شاردبمەوە .
- هیچت دەست نەکەوتووە و ئەنجامت نەداوە .
- نەخێر ..

نەخێر .. هیچم ئەنجام نەدا .. چونکە پزیشکایەتی ئەوە نیە کە نەخۆشیەکە دەستنیشان بکەم و چارەسەر بدەم و نرخەکەی وەرگرم ..

سەرکەوتن ئەوە ناگەیەنێت کە نۆڕینگەکەم پڕ بێت لە خەڵکی و قاسەکەم پڕ بێت لە ئاڵتون و ناوم بدرەوشێتەوە .. پزیشکایەتی کاڵا نەبووە .. سەرکەوتن پارە و ناوبانگ نیە .. پزیشکایەتی بریتیە لەوەی کە تەندروستی ببەخشمە هەموو کەس بەبێ هیچ مەرج و بەربەستێک .. سەرکەوتنیش ئەوەیە کە ببەخشم .. ( سی ) ساڵ لە تەمەنم تێپەڕیووە بێئەوەی ڕاستیەکان هەست پێ بکەم .. بێئەوەی لە ژیان بگەم .. بێئەوەی خۆم پێك بهێنم .. چۆن دەتوانم خۆم دروست بکەم کە بیر ناکەمەوە تەنها لە وەرگرتن و وەرگرتن

نەبێت لە کاتێکدا سەلماندنی خود تەنها بە بەخشین و بەخشین پێکدێت ..
بەڵام چۆن دەمتوانی ببەخشم ؟ شتێک کە بوونی نیە ؟
بە سۆزێکەوە سەرنجیدام و وتی :
- هەوڵبدە کەمێك بنوێت .
- ناتوانم .
- ئەو چاك دەبێتەوە دوای وەرگرتنی ئەو خوێنە .
- هەرگیز چاکنابێتەوە .
- تۆ جونەیهەکەشت لێ وەرنەگرت .
- ئاه .. بیرم مەهێنەوە .
- بەڵام ئایا دەتوانم بیرم بچێتەوە ؟
ئەو ژوورە تەنگەبەرە لەو ژێر زەمێنەدا , ئەو جێگە پیسە لەسەر زەویەکە ؟ ئەو خوێنەی هێنابویەوە ؟ ئەو ڕوخسارە زەردە ؟ ئەو دوو چاوە لاواز و بێهێزە ؟ ئەو قۆڵە باریکە درێژەی بەرەو ڕووم وەك ئەوەی نەشتەرێکی ڕاگرتبێت دڵ و مێشکی کردم بە دوو بەشەوە .. ئاە ..
سەرم نا بە سنگیەوە .. خۆمم تیایدا حەشاردا .. پێوەی نوسام .. هەستمکرد کە دوور لەو تەمەنەی گوزەراندومە بومەتەوە بە منداڵێک تازە خەریکە فێری ڕۆریشتن دەبم .. واملێهات پێویستم بە دەستێکی سۆز و بەزەیی هەبوو .. بۆ یەکەمجارە لە ژیانمدا هەستدەکەم کە پێویستم بە کەسێکە , تەنانەت پێویستم بە دایکیشم نەبووە .. سەرم لەسەر سنگی حەشاردا و گریام .. بە هێمنی و بێدەنگی .



# MEMOIRS OF A WOMAN DOKTOR

## نامەی د.نەوال سەعداوی بۆ وەرگێڕ

FROM : (.I.C.C.)    PHONE NO. : 4547846    Jan. 07 2001 02:35AM P1

٩/١/٢٠٠١

إلى أ. جبار كمال عبد الله  فاكس 0044/7076772722

تحيات وتقديرا وبعد

أشكرك على رسالتك بالفاكس. ويسعدني أنك تقوم بترجمة روايتي مذكرات طبيبة إلى اللغة الكردية - وأرجو إرسال نسخة إلي بالبريد من كتبي المترجمة إلى الكردية على عنواني بالقاهرة

مع الشكر والتقدير

د. نوال السعداوي

ملحوظة: أنا أفضل نشر الكتاب (مذكرات طبيبة) دون مقدمة جديدة

وشكرا